

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١١

(نیسان) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com






- هەنگاوەکانی قوتابیان لەگەڵ تەکنەلۆژیای سەردەم.
- ئەنتەرنێت هیچ مەترسیەکی نی یە لەسەر ژیانی ئەو کەسانەی کە بەکاری دێنن.



- خاڵە جیوازەکانی نێوان ترۆجان و کرمەکان و ڤایرۆس
- (HAKER)ەکان گەیشتنە مۆبایلیش !!.

هەولێر ـ ٢٠٠٦

ژماره 11
شوباتی 2006

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات



## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە رێگای سەرنووسەرەوە دەبێت

ناونیشان :
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێک یان ناردنی بابەتێک . پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەرێوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی
Email : computer_magazine_2005@yahoo.com
Email : aras_co_center@yahoo.com

**ئاگاداری**

بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆبلاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.

# پێرست





## بەرنامە 3

- (MELODY) چاکترین بەرنامەیە بۆ خوێندنەوەی فایلە میوزیکیەکان.
- بەرنامەی (دکتۆر واتسۆن).
زنجیرەی (٢) لەبەرنامەی AUTOCAD
- بەرنامەی (Desktop Dreamscapes)بۆ شاشەی جوڵاو.
- زنجیرەی فێربوونی بەرنامەی ئەکسیس
- بەرنامەی Virtual
- چۆنیەتی بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی تۆنی دەنگ لەبەرنامەی Cool Edit Pro
-بەرنامەی –PHOTORECOVERY Limited Edition 3.0.9.7
-زنجیرەی (٥)لەبەرنامەی فلاش MX
-بەرنامەی Paragon CD Emulator
-رۆشتنی تایتل لەسەر وێنە لەبەرنامەی میدیا ستودیۆ.
-بەرنامەی WAV Converter بۆ بچوکردنەوەی قەوارەی دەنگی.
- زنجیرەی (٥) لەبەرنامەی Adobe Premier
-بەرنامەی DVD TO MPEG
-بەرنامەیەکی گرنگ و پێشکەوتوو Ace opimizer utilites

## زانیاری 30

-چی دەکەیت ئەگەر بەهۆی ڤایرۆس کۆمپیوتەرەکەت کوژایەوە؟
- خاڵە جیاوازیەکانی نێوان ترۆجان و کرمەکان و ڤایرۆس.
- نهێنیەکانی ویندۆز ئێکسپی
- چوار شێوەی گواستنەوە فلم بۆ ناو کۆمپیوتەر
- وریابە لەکاتی بەکارهێنانی Ctrl+ C
- لابردنی پرۆگرام لە RUN دا
-چۆن دەتوانین وێنەیەك لەپارچە ڤیدیۆیێك وەربگرین.
- چۆنیەتی گۆرینی دەنگەکانی کۆمپیوتەر

## ریپۆرتاژ 40

هەنگاوەکانی قوتابیان لەگەڵ تەکنەلۆژیای سەردەم

## ئەنتەرنێت 43

- ئەنتەرنێت هیچ مەترسیکی نیە لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی ئەو کەسانەی کە بەکاری دێنن.
- بەکارخستنی خزمەت گوزاری تەلەفۆنی ئەنتەرنێت لە پرۆگرامی yahoo messenger دا.
- هەندێك لە سایتی ئەنتەرنێت بۆ فێربونی زمانی ئینگلیزی.
- چاککردنەوەی کۆمپیوتەری برادەرەکەت لەرێگای ئینتەرنێتەوە.
- هەموو شتێك لە ئەنتەرنێت بدۆزەرەوە.
- بەرنامەی (Google Mars) بۆ بینینی هەسارەی مەریخ!
- ئایا تۆ وابەستەی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بوویت.
- چی دەربارەی خزمەتگوازریەکانی کۆمپانیای گۆگل دەزانیت؟

## هەمەڕەنگ 54

- پەیوەندی بکە بەبێ ئەوەی ژمارەی مۆبایلەکەت دەرکەوێت.
- بچوکترین فلاش میمۆری.
- هاکەرەکان گەشیتنە مۆبایلەکانیش
- چۆنیەتی گۆرینی کاسێت بۆ CD
- کۆمپانیای (Sony Ericsson) مۆبایلی تازە دەکاتە بازارەوە.
- نوێترین دەزگا بۆ کاری دەنگی بەکاردێت.
- دروستکردنی پرۆسێسەری نوێ بەناوی (lntl D)
- بەرنامەی Game Gain - Make Game Run Faster

# (MELODY) چاکترین بەرنامەیە بۆ خوێندنەوەی فایلە میوزیکیەکان




ئا: سەعید عومەر

بەرنامەی میلۆدی کە یەکێکە لە بەرنامە سەرکەوتوو و ئاسانەکانی بواری خوێندنەوەی فایلە میوزیکیە دەنگیەکانە، کە لەپاڵ ئەوەی زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت کاری پێ بکرێت، لە هەمان کاتیشدا دیزاینێکی سادە و جوانی هەیە.

ئەم بەرنامەیە وەکو شێوەکەی لە وێنەی یەکەم بە دیار دەکەوێت دەتوانێت چەندان جۆری فایلی میوزیکی ئیش پێ بکات لەوانە: (PMP،MPA،MP2،MIDIMPEG، MIDI، MOD،WAV، MP3) سەرەڕای بەکار خستنی سیدی لەکاتی بەکارهێنانیدا.

ئەوەی ئەم بەرنامەیە جیادەکاتەوە لە بەرنامەکانی تری بواری میوزیکی بریتیە لە سادەیی شێوەکەیی و ئاسانی بەکارهینان و بەدیارکەوتنی هەموو فایلەکانە لەکاتی بەکارهینانی فایلێکدا وە شوێنی ئەو فایلەشت بۆ دیاری دەکات کە دەیخوێنێتەوە.

کاتێک ئەو بەرنامەیە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت جێگیر دەکەیت و پاشان دەیکەیتەوە و لە دوایشدا فایلێکی میوزیکی دەست نیشان دەکەیت بۆ خویندنەوەی، دەتوانیت لەرێگەی ماوسەوە لە تراکێکی میوزیکیەوە بچیتە تراکێکی تر یان ئەوەتا بە بەکارهێنانی دوگمەکانی کیبۆردەوە دەتوانیت ئەم کارە ئەنجام بدەیت، ئەمیش بە بەکارهێنانی دوگمەی (TOP) و (BUTTON) بۆ گۆڕینی تراکێک بە تراکێکی تر، یان (LEFT) و (RIGHT) بۆ بەرەو پێش بردنی مۆسیقاکە یان گۆرانیەکە یان گەڕاندنەوەی بۆ دواوە.

وە لە رێگەی میلۆدیەوە دەتوانیت هەموو ئەو گۆرانی و میوزیکانەی کە خۆت ئارەزوویان لێ دەکەیت، لە فایلیکی ئەو بەرنامەیە کۆ بکەیتەوە و پاشان بە بەردەوامی گوێ ی لێبگریت ئەمیش لە رێگەی فرمانی (MLD) کە لە وێنەی یەکەم بە دیار دەکەویت.

بە بەکارهێنانی ئەو بەرنامەیە پێویستیت بەهیچ بەرنامەیەکی تری خویندنەوەی فایلە میوزیکیە دەنگیەکان نابێت، بەلام ناتوانیت فایلە فیدیۆیەکان ئیش پێ بکات.






وێنەی (١)

# بەرنامەی (دکتۆر واتسۆن)

ئا: محمود محمد حسن ساڵەیی
mehmud_felek@yahoo.com

بەرنامەیەکی بچووکەو لە ناو سیستەمی ویندۆزدایە واتە پێویستی بە دابەزاندن نییە.

ئەم بەرنامە بچووکە یارمەتی سیستەمەکەت ئەدات لە کاتی کارکردندا و چاک کردنەوەی چەندەها هەڵە کە لە سیستەمەکەتدا روو ئەدات، ئینجا هەوڵ ئەدەم چەند روون کردنەوەیەک بدەم لە سەر ئەم بەرنامەیە :

بۆ چوونە سەر ئەم بەرنامەیە دەچینە سەر (RUN) و دەنووسین (DRWATSON) و پاشان (OK) دائەگرین وەک وێنەی ژمارە(١).

لە کاتی کارکردنی بەرنامەکەدا وەک لە وێنەکەدا دیارە لە بەشی لای راستی شریتی ئەرکەکان لە خوارە دەبینین لە سیستەمی (میلینیۆم)دا بەلام لە (XP)دا وەک هەربەرنامەیەکی تر ئاسایی دەبینرێ.

دوای کردنەوەی بەرنامەکە کاری خۆی ئەکات و تۆش چاوەروانی ئەو ناکەیت ئەنجامێکت بداتێ و کاری خۆت ئەکەیت.

وە ئەگەر ویستمان راپۆرتی بەرنامەکە ببینین یاخود گرفتێکی پێ رابگەیەنین ئەوە لە خوارەوە لە سەر شریتی ئەرکەکان دوو کلیکی لای چەپی لە سەر ئەکەین و چوار چێوەیەکمان بۆ ئەبێتەوە تۆش گرفتەکەتی پێ رائەگەیەنی وەک وێنە (٢).

هەروەها وەک هەر بەرنامەیەکی تر (OPTION)ی هەیە لە خوارەوە کلیکی لای راستی لە سەر ئەکەین و (OPTION) هەڵ ئەبژێرین و چوارچێوەیەکی تایبەت ئەبێتەوە وەک وێنە ژمارە (٣).

لە بەشی (LOG FILE)دا دوو فەرمان هەیە یەکەم کۆتا (١٠) فایل کە کاری تێدا کردووە.

دووەم کارەکانی لە چ شوێنێک هەڵ بگرێ.

وە لە بەشی (DISASSEMBLY)دا ژمارەی فەرمانەکان ئەخاتە روو.

وە لە بەشی (VIEW)دا لەکاتی نیشاندانی چوار چێوەی بەرنامەکە لە کاتی کارکردندا بە چ شێوەیەک بێت.

وە دەکری (LOG FILE)ەکان بکەینەوە هەر لە رێگای (OPEN) دا و کۆتا فەرمان (EXIT)ە بۆ دەرچوون.

# زنجیرەی (٣) لەبەرنامەی AUTOCAD


ئامادەکردنی: غزالە یونس




وێنەی (١)

## فرمانەکانی لیستی وێنە کردن (Draw)

خوێنەران پاش شارەزایی بونتان لەڕووبەری بەرنامەکە و شارەزایی بونتان لە دەستنیشانکردنی سنوری تابلۆی وێنەکردن وکردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ وە هەروەها گۆڕینی ڕەنگی تابلۆی وێنە کردن وە چەندان فرمانی تر.

جا لێرەدا لەبەشی سێ یەم وردە وردە دەچینە سەر ئایکۆن و فرمانەکانی تر. سەرەتا یەکەم لیست کەباسی دەکەم لیستی وێنەکردنە (DRAW). لیستی وێنەکردنیش هەموو ئەو ئایکۆنانە دەگرێتە خۆی کەتایبەتن بە وێنەکردن وەک (وێنەی ١).

### ١-ڕاستە هێڵ (Line):-

بێگوما ن زۆربەی زۆری هەر وێنەیەک کەدەمانەوێت بیکێشین پێویستمان بە ڕاستە هێڵ هەیە بۆ وێنەکردن یاخود دەتوانین وەک ڕاستەیەکی یاریدەدەر بۆ ئاسانکردنی وێنەکەمان بەکاری بهێنین. جالێرەدا بانگ کردنی فرمانەکە وەکێشانی ڕاستەهێڵ بەچەند ڕێگایەک دەبێت:-

١- دەچینە سەر شریتی لیستەکان پاشان دەستنیشان کردنی لیستی (DRAW) ئینجا تیری ماوس دەبەینە سەر یەکەم فرمان (LINE) کلیک لەسەری دەکەین، (وێنەی ١).

٢-لەشریتی زانیارییەکان (COMMAND) فرمانەکە دەنوسین (دەتوانین تەنها یەکەم پیت بنوسین پاشا ن ENTER (وێنە ی٢).

٣- تیری ماوس دەبەینە سەر شریتی کەرستەکان و LINE دەست نیشان دەکەین، (وێنە ی ٣).

وە بەگشتی هەموو ڕاستە هێڵێک خاڵی سەرەتاو خاڵی کۆتایی هەیە لێرەدا بەچەندین ڕێگا دەتوانین راستە هێڵ وێنە بکەین و بیکێشین:-

١- وێنەکردن بەیاریدەی ماوس وبە بە کارهێنانی (F8-ORTHO)، واتە لەکاتی وێنەکردن فرمانی LINE بانگ دەکەین ORTHO بە کاردەخەین ئینجا کلیکی یەکەم لە سەر ڕووبەری کۆمپیوتەرە کە دەکەین (واتە دەستنیشان کردنی



وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

خاڵی یەکەم) پاشـان دەسـتمان بۆ هەر لایەک ببەین بەپێی پێویسـتی وێنەکەمان کلیکـی دووەم دەکەیـن (واتـە دەسـت نیشان کردنی خاڵی دووەم) بەم شێوەیە دەتوانین بەردەوام بین . بەڵام بزانە ڕاستە هێڵەکان هەموویان بە شـێوەی ئاسۆیی یـان شـاقوڵی دەبێـت. وە بـۆ پچڕانـت لەڕاسـتە هێڵەکە دەتوانیت (ENTER) یان کلیکیی دەستە چەپ بکەیت .

٢-وێنەکردن بـە پێی تان و پۆی (X، Y) جەمسـەری: لەم جۆرەشـدا ڕاستە هێڵ بانـگ دەکەیـن بەهەمـان شـێوە بەڵام لێـرەدا زیاتـر دەبێت گۆشـەکەی زانراو بێت لە گەڵ درێژی ڕاسـتە هێڵەکە. واتە پـاش کلیگ کردنی یەکەم دەتوانین خاڵی دووەمی بدە ینێ بۆ نموونە ئەگەر درێژیی ڕاستە هێڵەکە ١٥٠ یەکەی درێژی بێت و بە گۆشە ی٤٥ لارە، ئە وا بۆ وێنەکردنی دەبێـت لە کاتـی نووسـیندا نیشـانەی @ لـە پێش دووری و گۆشـەکە دانێین. ئەم نیشـانەیە واتە دووری ڕاسـتە هێڵە کە لە خاڵی سـەرەتاوە. بەم شـێوەیەش دەنوسرێ وەک (@150<45 ).(وێنە ی٤).

لێرەدا دەتوانین وێنەی چوار گۆشـەو سێگۆشـە و وێنەی تر بکێشـین بەهۆی فرمانی ڕاسـتە هێـڵ بۆ نموونـە ئەگەر هاتوو وێنەی چوار گۆشەیەکمان دروست کرد درێژی لاکانـی ٢٠٠ یەکەی درێژی بێت .ئەوا بەهەردوو ڕێگای سەرەوە ئەم چوارگۆشە یە دروست دەکەین.

### ڕێگای یەکەم:-

LINE ENTER به بەکارهێنانی ماوس
COOMAND :LINE FROM POINT :10.10
ENTER
COOMAND : TO POINT :200 ENTER
COOMAND :TO POINT :200 ENTER
COOMAND: TO POINT :200 ENTER
COOMAND : TO POINT :200 ENTER
یان دوا هەنگاو دەنوسین COMMAND
:TO POINT :10.10 ENTER

### ڕێگای دووەم:-

بەڕێگـای تـان و پـۆکـان و زانینی گۆشەکانی

LINE: ENTER
INE FROM POINT
:10.10 ENTER COMMAND:L
OMMAND: TO POINT:@200<0
ENTER C ماوس بۆلای دەستەڕاست ببە
COOMAND : TO POINT :@200<90
ENTER ماوس بۆلای سەرەوە ببە
ENTER COMMAND:TO
POINT:@200<180 ماوس بۆلای دەستەچەپت



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

بە: COMMAND :TO POINT :@200<-90: ENTER

COMMAND :TO POINT :@200<-90:ENTER ماوس بۆ خوارەوە ببە یان دواهەنگاو دەنوسین.

COMMAND :TO POINT : CLOCS

لەهەردوو ڕێگای سەرەوەدا چوار گۆشەیەکی یەکسانمان دەست دەکەوێت وەک لە (وێنە ٥) دیارە.

بەڕێزان لێرە دا بۆ دروست کردنی (وێنەی ٦) ئەمەی خوارەوە هەنگاوەکانیتی:

LINE ENTER
FROM POINT: 200.50
TO POINT: @100<45
TO POINT: @100<135
TO POINT: @100<225
TO POINT: @100<315
TO POINT: @100<-45-

لێرەدا ئەگەر سەرنج بدەینە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە سەرەتا پاش بانگ کردنی فرمانەکە. لە یەکەم هە نگاودا سەرەتا نیشانەی @ دانراوە پاشان درێژیەکەی ئینجا نیشانەی (وSHIFT+ که دەبێتە نیشانەی گەورەتر واتە (<) ئینجا گۆشەکە دەنوسین.

جا ئێوەش دەتوانن چەندان جۆری تر لە وێنە دروست بکەن سود لە فرمانی ڕاستەهێڵ وەربگری.

٢-بازنە (CIRCLE):-

هەر لە هەمان لیستدا باس لە فرمانێکی گرنگ دەکەین کە ئەویش زۆر لە وێنەکاندا پێویستمان پێی دەبێت ئەویش بازنەیە، بازنە دەتوانین بە زۆر ڕێگا باسی بکەین و دروستی بکەین:-

١-(CENTER.RADUIS)بە زانینی نیوە تیرەکەی (RADUIS).

٢-(CENTER.DIAMETER) بە زانینی تیرەی بازنە (DIAMETER).

٣-( POINT 2) زانینی دووخاڵی سەر بازنە .

٤- (POINT 3) زانینی سێ خاڵی سەر بازنە .

٥- (TAN TAN RADUIS) زانینی نیوە تیرە و دوو شێوە (وێنە) ببنە لێکەوت بۆ بازنە .

٦- (TAN TAN TAN) سێ شێوە (وێنە) ببنە لێکەوت بۆ بازنە کە بەبێ زانینی نیوەتیرەکەی.

شێوەی دروست کردنی بازنەش لە (وێنە ی ٧) دەردەکەوێت.



وێنەی (٧)

# بەرنامەی (Desktop Dreamscapes) بۆ شاشەی جوڵاو

## بەختیار سەباح رواندزی

بەرنامەیەکی زۆر جوانە، بەکاردێت بۆ شاشەی جوڵاوی کۆمپیوتەرەکەت. لەهەمانکاتدا تۆ دەتوانیت کاری خۆشت بکەیت بەبێ ئەوەی ئایکۆنەکانی سەر (DESKTOP) بزر ببن . جگە لەمەش لەگەڵ جولانەکە دەنگێک دەبیستیت .

چۆنیەتی کار پێکردنی بەرنامەکە، دوای ئەوەی بەرنامەکەت دابەزاندە سەر کومپیوتەر، لەسەر(DESKTOP) کلیکی لای راست دەکەیت، دەبینیت، فرمانێک لەسەرەتای لیستەکە بەناوی (DESKTOP DREAMSCAPE) زیاد بووە، هەروەک لە وێنەی (١) ڕونکراوەتەوە .

هەر کاتێک ئاراستەی ماوسەکەی دەبەیتە سەر لیستێکی فرعی دەبێتە، بۆ دەست پێکی جولانەکە کلیک لەسەر (3D DESKTOP ) دەکەیت نیشانی ( √ ) لە پێش زیاد دەبێت . بۆ وەستانی جولانەکە کلیک لەسەر هەمان فرمان دەکەیتەوە، هەروەک لە وێنەی ژمارە (٢) دیارە، نمونەیەک لە جولاوی شاشەکە .

وە بەهەمان شێوە چەندین فرمانی تری تێدایە، دەتوانی بەکاریان بهێنیت، وەکو زیادکردن کەمکردنی دەنگ، لابردنی دەنگ ڕاگرتنی جولانەکە بە شێوەیەکی کاتی .

بە هیوای سوود وەرگرتن .




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

زنجیرەی فێربوونی بەرنامەی ئەکسیس

# راپۆرتەکان (Reports)

ئا: ڕێبوار نوری

باشترین ڕێگایە بۆ سوود وەرگرتن لە داتای ناو خشتەکان و پیشاندانی داتاکەت لە شێوەی زانیاری پوختەکراو کە ئەتوانرێت چاپ بکرێت، چونکە وەک راپۆرت ئەتوانیت کۆنترۆڵی وردەکاریەکانی هەموو بەشەکانی سەر راپۆرتەکە بکەیت و زانیاریەکان بەو شێوازەی کە ئەتەوێت پیشانی بدەیت.

زۆربەی راپۆرتەکانیش داتا لە خشتەیەک یان کوێریەک یان زیاتر وەردەگرن (واتە لە سەرچاوەیەک یان زیاتر چ خشتە بێت یان کوێری) مەرجیش نیە راپۆرت هەموو کێلگەکانی ناو خشتەکە لە خۆبگرێت، بەڵکو ئەتوانیت راپۆرت بۆ هەموو یان بەشێک لە کێلگەکانی هەر خشتەیەک دروست بکەیت بۆ پیشاندانی زانیاریەکان و چاپکردنیان.

کۆنترۆڵە بەستراوەکان بە کێلگەکانی خشتەی سەرچاوە داتا لە خشتەکە وەردەگرتن، بەڵام ناوی ستوونەکان و ناونیشانی راپۆرتەکەو ڕێکەوتی چاپ و ژمارەی لاپەرەکان لە دیزاینی راپۆرتەکە دانراوە.




وێنەی (١)

دروستکردنی راپۆرت:

سێ ڕێگای سەرەکی هەیە بۆ دروستکردنی راپۆرت:

١- ڕێگای DESIGN VIEW.
٢- ڕێگای AUTOREPORT.
٣- ڕێگای REPORT WIZARD.

لەبەر درێژی باسکردنی ڕێگاکان، لێرەدا تەنها باسی ڕێگای دووەم و سێیەم دەکەین و هەر ڕێگایەکە لە زنجیرەکە باس دەکەین.

دروستکردنی راپۆرت بەڕێگای AUTOREPORT بەبەکارهێنانی یەک سەرچاوەی داتا (خشتە بێت یان کوێری).

بۆ دروستکردنی راپۆرت بەم ڕێگایە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر:

١- لە لیستی تەنەکان OBJECTS لە چوارچێوەی داتابیس یەک کلیک لەسەر REPORTS بکە (وێنە ١).

٢- لە لیستی ئامرازەکانی چوارچێوەی داتابیسەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW بکە، دوای ئەو خانەیەی خوارەوە




وێنەی (٢)






وێنەی (٣)




وێنەی (٤)

دێتە سەر شاشە چەند ڕێگەیەک پیشان دەدات بۆ دروستکردنی ڕاپۆرت (وێنە٢).

٣- لە خانەی سەرەوەی لای ڕاست یەک کلیک لەسەر ڕێگای :AUTOREPORT COLUMNAR بکە.

٤- لە ژێرەوەشی لیستی ناوی خشتەکان بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی خشتەی (TBLBOOKS) بکە (وێنە٣).

٥- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە.

دوای ئەوە پرۆگرامی ئەکسێس خۆی دەست دەکات بە دروستکردنی ڕاپۆرتەکەو دوای تەواوبوونیش دەیکاتەوەو دەیهێنێتە سەر شاشەو جۆری پیشاندانی داتاکەی لە شێوازی COLUMNAR دەبێت وەک لەم وێنەیەی خوارەوە دیارە (وێنە٤).

٦- بۆ داخستنی ڕاپۆرتەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی X بکە، نامەیەکی ئاگادارکردنەوە دێتە سەر شاشە ئاگادارت ئەکاتەوە لە کۆگەکردنی ڕاپۆرتەکەت (وێنە٥).

٧- بۆ کۆگەکردنی ڕاپۆرتەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی YES، ئینجا خانەی ناونانی ڕاپۆرت دێتە سەرشاشە، کە خۆی ناوی TBLBOOKS کە ناوی خشتەکەیە وەک دیفۆڵت هەڵبژاردووە بۆ ناوی ڕاپۆرتەکە، تۆ بە نیشانەی ماوس یەک کلیک لەسەر ناوەکە بکەو ئینجا بیسڕەوە، ئینجا ناوی ڕاپۆرتەکەت بگۆڕە بۆ RPTBOOKS.

٨- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە.

ئەگەر تەماشای چوار چێوەی داتابێسەکە بکەین دەبینین کە ناوی ڕاپۆرتەکە لە ژێر تەنی REPORTS دەردەکەوێت وەک لەم وێنەیە خوارەوە دیارە (وێنە٦).

**تێبینی:**

بۆ بەکارهێنانی ڕێگاکانی تری AUTOREPORT وەک TABULAR هەمان ئەو هەنگاوانەی سەرەوەی بگرە بەر بە جیاوازی هەڵبژاردنی ئەو جۆرەی AUTOREPORT کە ئەتەوێت. واتە لە جیاتی AUTOFROM: COLUMNAR جۆری AUTOREPORT: TABULAR هەڵبژێرە بۆ دروست کردنی ڕاپۆرت بە شێوازی خشتەیی.




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)

وێنەی (١)

# بەرنامەی Virtual DJ

ئا: هێرش اسماعیل

بەڕێزان بێگومان زۆربەمان حەز بەگۆڕینی دەنگ دەکەین ئەمەش ئەگەڕێت و بەدەستی خۆمان ئەو دەستکاریی یەی ئەنجام بدەین ئەوا چێژەکەی خۆشتردەبێت بۆ ئەم کارەش چەند بەرنامەیەکی جۆراو جۆر هەیە ناتوانم بڵێم کامیان لەکامەیان بەهێزترە لەبەرئەوەی هەریەکەو چەند کارێکی تایبەت بەخۆی ئەنجامدەدات هەروەها هەریەکەو چەند گۆڕانکاریەکی دیاریکراو بەسەر دەنگ دا دەهێنن من بەباشم زانی کەباس لەبەرنامەی VIRTUAL DJ دا بکەم خۆشەویستان ئەم بەرنامەیە کاتییە واتا DEMO یە بەڵام بۆبەدەست هێنانی ئەم بەرنامەیە بەفوول ڤێرژن بڕێک ماندوبوونی دەوێت ئازیزان من کاتێ ئەوبەرنامەم بەدەست گەیشت هەوڵم دا لەئەنتەرنێت بەتەواوی داوون لۆدی بکەم بەڵام لەبەر نەبوونی کات پشت گوێم خست وەهەروەها ئامۆژگاری ئێوەی خۆشەویست دەکەم کە پشت گوێی نەخەن لەبەر ئەوەی سودێکی زۆری هەیە و ئەو شتەی کەلەستۆدیۆکان پارەیەکی زۆرمان لێوەردەگرن هەروەها بەدڵی ئێمەش کارناکەن واتا ئەو شتەی ئێمە لەناخمان

دامـان ناوە بۆگۆڕینی ئـەم دەنگە ئەوان نایکەن یاخود هەر ناتوانن ئەنجامی بدەن ئا لـەم کاتـەدا بەرنامـەی VIRTUAL DJ زۆر بەئاسانی ئەنجامی دەدات هەروەها بەکەرهێنانیشـی زۆر ئاسـانە سـەرەتا بەرنامەکـە دەکەینـەوە لەخـوارەوەی بەرنامەکە وێنەی هاردەکانی نیشـانداوە تۆ لەوێوە هەردەنگێکت هەبێت لەناو کام هـارد بێـت دەتوانی ئەو هـاردە یەکجار کلیک بکەیت دەنگەکە دێتە ناو بەرنامەکە وەک لە(وێنـە ١) دا دیـارە هەروەهـا لەناوەڕاست پلەی هەیە بۆ بەکارخستنی بەرنامەکـە هەروەها دەتوانـی بەماوس گۆرانیەکـە لەخـوارەوەی بەرنامەکـە هەلگری بیخەیتە سـەر دیسـکەکە وەک لـە (وێنە ١) دا دیارە هەروەها بۆگۆڕینی زیاتر واتا SAMPLE سەیری (وێنە ٢) بکە بەڕێزان ئەگەر سـەیری ئاراسـتە سـپی یەکان بکەن دەتوانن ئێوەش بەم شێوەیە بەرنامەکـە بەکار بهێنن هەروەها لەکاتی داخسـتنی بەرنامەکـە هەمووشـتەکان بەخـۆی هەڵدەگرێـت لەنـاو فایلی خۆی لەکۆمپیوتەرەکـەت واتا پێویسـت ناکات خـۆت خەزنی بکەیت بەڕێزان بۆزانیاری زیاتـر وهەروەهـا بۆهێنانـی بەرنامەکە بەتـەواوی پەیوەنـدی بـەم ئیمێلـە بکە WWW. VIRTUAL DJ.COM




وێنەی (٣)

# چۆنیەتی بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی تۆنی دەنگ لەبەرنامەی Cool Edit Pro

ئا: کاوە سلێمان

بەرێزان وەک هەموو زنجیرەکانی پێشوو وا لەم زنجیرەیەشدا باس لە کارێکی زۆر گرنگی بەرنامەی کوول ئیدت پرۆ دەکەین، خۆشەویستان پێویست بەوەناکات کەلە چاکی ئەو بەرنامەیە بدوێین چونکە هەرچەندی بەسەردا بڵێین ناگاتە ئاستی ئەو کارەمەزنەی کە PITER ئەنجامیدا ئەویش دروست کردنی بەرنامەی COOL EDIT PRO بوو کە بەڕاستی هەموو جیهان پێویستی بە بەرنامەیەکی لەم جۆرە هەبوو کە تەوای ئەو گۆرانکاریانەی بەسەر دەنگ دا دێن COOL EDIT PRO دەتوانی هەرهەموویان بەسەرکەوتوی ئەنجام بدات کرداری بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی تۆنی دەنگ شتێکی زۆر پێویستە هەمووما‌ن کارمان پێی دەبێت بەتایبەتی ئەوانەی کاری ستۆدیۆکان یاخود دۆبلاجی فلم و ئەفلام کار تۆن و شتی تردەکەن ئەم کارەش سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە ئینجا ئەو دەنگەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە پاشان ئەو شوێنەی پێویستمانە دەستکاری بکەین بەماوس دیاری دەکەین ئینجا دێین EFFECTS دەکەینەوە لەوێوەش TIME/PITCH دەکەینەوە لەوێوەش PITCH BENDER هەڵدەبژێرین بەم شێوەیە (وێنە ١) پاشان لیستێک دەبێتەوە لەناوەڕاستی لیستەکە FLAT نوسراوە یەکەم جار بەماوس کلیکی لەسەردەکەین بۆئەوەی دەنگەکە بێتەوە باری ئاسایی خۆی پاشان لەناوەڕاستی ئەم لیستە هێڵێکی راست دیاریکراوە تۆ ئەو هێڵە بەرزو نزم دەکەیتەوە دەنگەکەش بەگوێرەی ئەم هێڵە بەرزو نزم دەبێت هەروەها لەرێگای PREVIEW دەتوانی گوێبیستی گۆرانکاریەکان بیت ئینجا ئۆکەی دەکەیت (وێنە٢).



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

# بەرنامەی
# PHOTORECOVERY-limited Edition 3.0.9.7




## ئا: سەروین

خۆشەویستان بەراستی نووسینی بەرنامەیەکی لەو جۆرە زۆر سانایە بەلام ئەوکارانەی بۆمانی ئەنجام دەدات زۆرسانا نین بەڕاستی جیاکەرەوەی وەک ئەم بەرنامەیە شتێکی ئاسان نیە لەبەر ئەوەی ئەگەر بێت و من سیدییێکی کۆلێکشن دەخەمە سەر کۆمپیوتەرەکەم من نازانم ئەو کۆلێکشنە چەند وێنەی تێدایە و چەندیش پارچە ڤیدیۆی تێدایەو چەندیش فایلی ئەنتەرنێتی تێدایە دەتوانم سەیریان بکەم و وێنەکان بدۆزمەوە و

هەروەها پارچەڤیدیۆکانیش بدۆزمەوە بەلام کاتێکی زۆرم لەدەست دەچێت لەم کاتەدا بەرنامەی PHOTORECOVERY ئاسانکاریەکی تەواوم بۆدەکات هەروەها بەکارهێنانیشی زۆر ئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە لەلای چەپ لەبۆشاییێکدا وێنەی سیدیرۆم و رایتەری دیاری کردوە ئەگەر تۆ سیدیەکە بخەیتە سەر سیدیرۆمەکە پاشان بەماوس یەکجار کلیک لەسەر وێنەی سیدیرۆمەکەبکەیت لەناو ئەو بەرنامەیە

ئینجا لەژێر ئەو بۆشاییەی (بدء فحص) نوسراوە یەکجار بەماوسەکەت کلیکی لەسەر دەکەیت خۆی بەدوای جۆری فایلەکان دا دەگەڕێت هەر وەها لەناوەراستی بەرنامەکەش بۆشایەک هەیە کە (الصور) نوسراوە واتە وێنەکان ئەگەر ئەمەیان بکەیتەوە دەبینیت چەند نوسراوێکی تر دەکەونە بەرچاو وەک الصوت و VIDEO واتا ئەگەر دەنگت بوێت الصوت هەڵدەبژێریت وە ئەگەر ڤیدیۆت بوێت VIDEOهەڵدەبژێریت بەم شێوەیە ئەم بەرنامە بەهێزە سیدیەکەت بۆ شیدەکاتەوە (وێنە ١).

# زنجیرەی (٥) لە بەرنامەی فلاش MX

## ڕەنگەکان لە فلاشدا

فەیسەڵ




وێنەی (١)

هەروەک هەر بەرنامەیەکی تری وێنە، بەرنامەی فلاش MX قاڵبی زۆر باشی ڕەنگەکان لە خۆی دەگرێ بۆ دەستکاری کردن و ڕەنگ کردنی شێوەکان، یەکێ لە پێکهاتە ڕەنگیەکان لەم بەرنامەیە بریتی یە لەCOLOR SWATCHES . وێنەی (١).

COLOR SWATCHES بۆ دوو جۆری دیاری کراوی ڕەنگ کردن بەکاردێت:

١- بۆیەکردن

٢- قەڵەم STROKE COLOR

کە لە ڕێگایانەوە دەتوانین گۆڕانکاری بە سەر ڕەنگەکان بهێنین و هەروەها بە ئارەزووی خۆمان ڕەنگەکان دروست بکەین.

### زیادکردنی ڕەنگ

١- ئامرازی تێکەڵ کردنی ڕەنگەکان COLOR MIXER : لە ڕێگای ئەم ئامرازە دەتوانین ڕەنگەکان تێکەڵ بە یەک بکەین و بە ئارەزووی خۆمان ڕەنگ دروست بکەین و کارەکەی بریتی یە لە تێکەڵ کردنی ڕەنگەکان بە ئارەزووی بەکارهێنەری فلاش، ئەم ئامرازە (٤) پێکهاتەی هەیە:

أ - SOLID:بریتی یە لە یەک ڕەنگ و هیچ ڕەنگی تری لەگەڵدا تێکەڵ ناکرێت وەک سوور یا زەرد یاهەر ڕەنگێکی تری نێو ئامرازی ڕەنگەکان SWATCHES. وێنەی(٢).

ب - LINEAR: بریتی یە لە تێکەڵەی دوو ڕەنگی جیاوازی تێکەڵ کراو وە لە شوێنێکی دیاری کراو یا بەگوێرەی ئارەزووی بەکارهێنەر. وێنەی(٣).

ج - RADIAL COLOR:ڕەنگی بازنەیی کە ئەو ڕەنگەی لە لای چەپەیە دەبێتە ڕەنگی بازنەیی ناوەڕاستی ئەو ڕەنگەی کە لە لای ڕاستەیە. وێنەی(٤).

د- وێنە: بە کار هێنەری بەرنامەی فلاش دەتوانی بە ئارەزووی خۆی وێنەیەک بهێنێ لە ڕێگای فەرمانی IMPORT لە لیستی FILE . وێنەی(٥).پاشان دەچینە سەر لیستی تێکەڵ کردنی ڕەنگەکان COLOR MIXERو دەبینین کەوا وێنەکەی




وێنەی (٢)



وێنەی (٧)

هێناومانـە لـە دوا جـۆری رەنگەکانە، بەمـەش دەتوانی کەوا شـێوەیەک بکێشی و وێنەیەکی تێدا بئاخنی وەک رەنگ کردنی بە شێوەکە.

### چۆنیەتی دروستکردنی رەنگ

١- پلە داری رەنگ هەڵدەبژێرین بۆ نمونە RADIAL.

٢- پاش دروستکردنی رەنگەکان لە لیستی WINDOWSدەچینە سەر ئامرازی SWATCHES.

٣- دەچینـە شـوێنێکی بەتاڵ لـەم ئامرازە و شـێوەی بۆیە کردنـمان بـۆ دەردەچێـت و کلیکی دەکەین دەبینیـن رەنگەکە دروسـت بووە، هـەر وەک ئـەو نمونەیـە لە وێنـەی(٦،٧) دا دیارە.

قەڵـەم: تەنهـا یەک رەنگ بە کار دەهێنێ ئەویش بریتی یە لە SOLID واتە تاکە رەنگ.

بۆ کاڵی و تۆخی رەنگەکانیش بە هۆی ئامرازی تێکەڵ کردنی رەنگەکان COLOR MIXERدەتوانین کاربکەینە سـەر رەنگەکان بـە هۆی کاریگەری ALPHAکە هەر چەند بەهاکەی زیاد بکەین ئەوارەنگەکـە تۆخ تـر دەبێت و بە پێچەوانە گەر بەهاکەی کەم بکەین ئەوا رەنگەکە کاڵتر دەبێت لە وێنەی (٨)دا سەیر دەکەین کەوا بە های ALPHA بۆ رەنگەکان بریتی یە لە ٤٦٪ و رەنگی سەوز کاڵە.



وێنەی (٨)

# بەرنامەی Paragon CD Emulator

وێنەی (١)

روبەند مصطفی

ئەوبەرنامەیە سودی لێ وەردەگیرێت بۆ ئەوەی بتوانی کۆمپیوتەر وەک ئامێرێکی کۆپی بەکۆمەڵ بەکاربهێنێت وە ئەم بەرنامەیە چەند رەقیبێکی هەیە کەهەموویان هەمان کاردەکەن بەڵام وەک ئەو بەرنامەیە سەرکەوتو نین ئەوانی تر زیان بەسیدیەکان دەگەیەنن بەڵام ئەم بەرنامەیە بەپێی تاقیکردنەوە سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە.

سەرەتا پاش دابەزاندنی لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە IMAGE دەکەینەوە لەوێوە CREATE CD IMAGE کلیک دەکەین ئینجا NEXT دەکەین بەم شێوەیە (وینە١) پاشان سێ لیستی تر بەدوای یەک دێن هەر سێ لیست NEXT دەکەین ئینجا چاوەڕێ دەکەیت تا تەواوبوونی کۆپییەکە (وینە٢).




وێنەی (٢)




# ڕۆیشتنی تایتل لەسەر وێنە لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

ئا: فاخر مەحمود میرزا

خۆشەویستان وادیسان بەیەک دەگەینەوە لە زنجیرە بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ بەڕێزان لەم جارەشدا وەک جارانی تر باس لەکارێکی زۆرگرنگ دەکەین کە ڕۆژانە زۆر پێویستمان




وێنەی (٢)

دەبێت بەتایبەتی بۆئەوانەی کەحەزدەکەن لە تەلەفزیۆنەکان کاربکەن وە یاخود بۆدروستکردنی ریکلام و هەرنووسینێک بێت بەڕێزان سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە ئینجا ئەو نووسینەی لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ کردوومانە دێنینە ناو بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ بەهۆی کلیک کردن لەسەر بۆشایی خوارەوەی بەنارمەکە لیستێک دەبێتەوە لەناوەراستدا IMAGE FILE نووسراوە کلیکێکی لەسەردەکەین ئینجا لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا ئەونوسینەی لەناو هاردەکەی کۆمپیوتەرەکەت هەڵت گرتوە OPEN ی دەکەیت بۆناو بەرنامەکە بەمەرجێک دەبێت نووسراوەکە لەریزی سێیەم بەرەو خوارەوە دابنێیت هەروەها دەبێت نوسراوەکە بەفۆتۆشۆپ بێت نابێت بە جۆری JPG یاخود هەرجۆرێکی تر خەزن کرابێت (وێنە١) ئینجا نووسینەکە لەڕیزی سێیەم دادەنێین پاشان بەلای راست کلیک لەسەر نوسراوەکە دەکەین لیستێک دەبێتەوە کەلەناوەڕاستی لیستەکە OVERLAY OPTION نوسراوە بەماوس کلیکی لەسەردەکەین لیستێکی تر دەکەوێتەبەرچاو لەم لیستەدا سەیر دەکەین نووسینەکە کەوتۆتە سەر وێنەکە ئینجا OK دەکەین بەم شێوەیە (وێنە ٢).

# بەرنامەی WAVE CONVERTER بۆ بچوککردنەوەی قەوارەی دەنگی

WAV Converter
مساعدە خیارات ملف
Format:
Size:
Playback time:
Sampling rate:
Channels:
Bit depth:

وێنەی (١)

**ئا: دیلمان**

زۆر بەی ئەوکەسانەی کار لەبواری مۆبایلدا دەکەن و وەئەوکەسانەی کە کاری دەنگی دەکەن پێویستیان بەم بەرنامە دەبێت چونکە ئەم بەرنامەیە زۆر قەوارەی بچوک دەکاتەوە لەمێگابایتەوە بۆ کیلۆ بایت واتا زۆر بەئاسانی دەچێتە ناو مۆبایلەکانەوە، کارپێکردنی ئەم بەرنامەیە بەم شێوەیە دەبێت:

لەسەتاوە دەچینە سەر فایلی ئۆپن و ئەو شوێنەی کە گۆرانیەکی لێدانراوە دەیکەینەوە (وێنەی ٢).

پاش کرنەوەی دەبینین کە جۆرو خولەکەکانی و مێگایەکەو جۆری دەنگەکە




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)




وێنەی (٧)

بۆمان دیاری دەکات (وێنەی ٣).
پاشان دەچینە سەر هێمای CONVERTER کلیکی دەکەین (وێنەی ٤). دەبینین دەست بەرێندەرێک دەکات بۆ بچوککرنەوەی دەنگەکە (وێنەی ٥).
دەبینین قەوارەو جۆری دەنگەکە وهێماکانی گۆردراون بەشێوەیەک زۆر کەمتر لەهی پێشوو (وێنەی ٦).

لەکۆتاییدا دەچینە سەر سەیڤکرنی دەنگە بچوککراوەکەو خەزنی دەکەین (وێنەی ٧).




### کۆنترۆڵ کردنی خێرایی دیمەنەکان

بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی خێرایی دیمەنەکان لە ئەدۆبدا ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

١- سەرەتادا دەچینە سەر پارچەی کۆتایی لە دیمەنی دووەم




وێنەی (٢)




وێنەی (١)

CYCLERS.AVI و پارچەی یەکەمی دیمەنی سێیەم.FASTSLOW.AVI، وە هەڵدەستین بە کورت کردنەوەی کاتی دیمەنی دووەم بە جۆرێک کەوا لە چرکەی (٨,٠٥)کۆتایی پێ بێت، وە پاشان هەڵدەستین بە زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوەی نێوان هەر دوو دیمەن، بۆ ئەنجامدانی ئەم کردارەش دەتوانین سوود لە پەنجەرەی زانیاریەکان INFO وەرگرین، وە ئەگەر ئەم پەنجەرەیە لە سەر رووکاری بەرنامەکە نەبوو ئەوا لە لیستیWINDOW فەرمانی SHOW INFO هەڵدەبژێرین بۆ بە دیار خستنی . وێنەی (١)، وە فەرمانی ROLLING EDIT کارا (تفعیل) دەکەین.

٢- خاڵی دەستکاری و بە یەک گەیشتنی نێوان هەر دوو دیمەنی دووەم و سێیەم بۆ لای چەپ رادەکێشین. وێنەی(٢).

٣- لەکاتی راکێشاندا چاودێری شوێنی خاڵی نیشاندانی هێڵی دەستکاری لە پەنجەرەی INFO دەکەین، وەرادەکێشین تا چرکەی (٨,٠٥) . وێنەی(٣).

٤- ئێستا نمایشی دیمەنەکە دەکەین بە کلیک کردنی دوگمەی PLAY لە پەنجەرەی PROGRAM یا بە هۆی دوگمەی بۆشاییSPACE لە کیبۆرد . وێنەی (٤).




وێنەی (٣)




وێنەی (٥)

٥- هەڵدەستین بە زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوە لە نێوان هەردوو دیمەن، سەرەتا دەبێ دڵنیا بین کەوا هێڵی دەستکاری لە چرکەی (٨٠٥) ڕادەوەستێ، چونکە خاڵی بەیەک گەیشتنی نێوان هەردوو دیمەنی دووەم و سێیەم لەوێ دایە، بە ئاسانی دەتوانین هێڵی دەستکاری بجوڵێنی بۆ شوێنی مەبەست ئەویش بە کلیک کردنی فەرمانی NEXT EDIT و (ژمارە ١) PREVIOUS LOCATION (شوێنی ئیستا) (ژمارە ٢) لە ڕێگای پەنجەرەی PROGRAM ەوە وە چاودێری کردنی هەڵبەزەی هێڵی دەستکاری و شوێنەکەیشی لە پەنجەرەی TIME LINE. وێنەی (٥).




وێنەی (٤)




وێنەی (٦)




وێنەی (٧)

٦- بۆ زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوەی خێرا بە تایبەتمەندی ستاندەر دەتوانی بە ئاسانی ئەنجامی بدەین بە کلیک کردنی دوگمەی زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوەی پێوانەیی ADD DEFAULT TRANSITION لە پەنجەرەی بینین PROGRAM، و یا داگرتنی هەردوو دوگمەی(CTRL+D). وێنەی (٦).




وێنەی (٨)




وێنەی (٩)




وێنەی (١٠)




وێنەی (١١)

٧- دوای ئەنجامدانی ئەم کارە پەنجەرەی دیاری کردنی تایبەتمەندی FIX TRANSITION دێتە سەر شاشە کە دەتوانی هەڵبژێردراوە ستاندەرەکە لە پرۆژەکەمان قبوڵ بکەین بە کلیک کردنی OK . وێنەی (٧).

٨- ئەم کردارەش یارمەتی دەری خێرایە بۆ زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوە، پاش زیاد کردنی کاریگەریەکە دەتوانین لە پەنجەرەی دەستکاری TIME LINEببینین، وە بۆ ئەوەی زیاتر لە کردارەکە تێ بگەین دەتوانی چینی ڤیدیۆی سەرەکی VIDEO1فراوان بکەین ئەویش بە کلیک کردنی دوگمە بچوکەکەی TRACK MODE . وێنەی (٨).

٩- دەبینین سەرجەم فایلەکان لە یەک چینی ڤیدیۆ دابەزیوە ئەویش چینی ڤیدیۆ VIDEOیە، لە بەر ئەوەی ئێمە لە شێوازی دەستکاری SINGLE TRACK EDITINGکاردەکەین، چینی ڤیدیۆ VIDEO1 لە دوو چین پێک هاتووە، هەروەها دەبینین کە دیمەنی دووەم لە چینی خوارەوەی چینی یەکەمی ڤیدیۆ دانراوە بۆ ئەوەی بتوانین کاریگەری گواستنەوە لە نێوان هەردوو دیمەن لە یەک چیندا زیاد بکەین . وێنەی (٩).

١٠- بۆ پاشگەز بوونەوە لە کرداری زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوە:

أ- لە پەنجەرەیHISTORY دوا کردار هەڵدەبژێرین APPLY DEFAULT TRANSITION دواتر دوگمەی DELETE دا دەگرین وێنەی (١٠).

ب- لە لیستی EDIT فەرمانی UNDO هەڵدەبژێرین وەیا هەردوو دوگمەی CTRL+Z لە کیبۆرد دادەگرین. وێنەی (١١).

# بەرنامەی DVD TO MPEG

ئا: دارەوان

ئازیزان خۆشەویستان سیستەمی DVD سیستەمێکی دیجیتاڵی ڤیدیۆیە جۆرە تایبەتمەندیەکی هەیە لەرووی کارکردنی و شێوەی پێوانەیدا، زۆرجار پێویست دەکات کە سیدی DVD بگۆڕین بۆ VCD بۆیە دەبێ ڕێگای کارتی گۆڕین بەکاربێنین بۆ گۆڕینی، بەلام ئەم بەنارمەیە زۆر بەئاسانی بۆمان دەگۆڕێت لەفایلی DVD یەوە بۆ فایلی VCD بەبێ بەکارهێنانی کارتی گۆڕین ئەویش بەم




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

هەنگاوانەی خوارەو:
لەسەرەتاوە کلیکی بەرنامەکە دەکەین لەپاشان دەچینە سەر هێمای سیدیەکە (وێنەی ٢).

ئەوشوێنە هەڵدەبژێرین کە فایلی DVD تیدایە ئۆپینی دەکەینەوە پاشان کەمێک چاوەڕوانی وئینجا تاوەکو فایلەکە لەناوخانەکدا دەبێتەوە (وێنەی ٣).

لەدوایدا دەچینە سەر هێمای سیدیە سوورەکە کلیک دەکەین ئینجا لەوشوێنەی کەدەمانەوێت سەیڤی دەکەین (وێنەی٤).




وێنەی (٤)

# بەرنامەیەکی گرنگ و پێشکەوتوو
# Ace opimizer utilites

بێستون عمر (زنجیرەی یەکەم)

کۆمپیوتەر وەک یەکێک لە پێداویستیە گرنگە کانی ژیان وەک خزمەتکارێکی گرنگی ژیان وەک کارئاسانکاریەکانی کاروباری خەڵک و دەوڵەت و ڕوچونی بۆ ناو هەموو کارێک تەنانەت یاری کردن و ئەتاری نەخشە سازی وردو وێنەکێشان و هتد، ئەوە بابەتی ئێمە نیە من باس لە پاراستنی کۆمپیوتەر دەکەم. دیارە وەکو لای هەمووان ئاشکرایە کە کۆمپیوتەریش وەکوهەر ئامێرێک پێویستی بە پاراستن و چاودێریکردنی هەیە، هەر بۆیەش چەندان ڕێنمایی و ئامۆژگاری و بەرنامەی تایبەتی کۆمپیوتەر هەن . پاراستنی کۆمپیوتەر و چاودێریکردنی ڕێگە لە کێشەی سادە



وێنەی (٢)

دەگرێت گەورەبین و تەشەنە بکەن. کۆمپیوتەر هەمان تایبەتمەندی ددانەکانی مرۆڤی هەیە لە پاراستن مەبەست چۆن ئەگەر ددانەکان نەشۆرێن و ئاگادار نەبیت ئەوا لەناو دەچن جا بەرێزان کۆمپیوتەریش هەمان شت کێشە بچوکەکان یان هەڵە بچوکەکان ئەگەر بە ئاگا نەبیت ئەوا کێشەکان گەورە دەبن کە زۆرجار بە لەناوچونی کۆمەڵێک بەیانات و فایلی تایبەت کۆتایی دێت یان ئەوەتا بە تێکچونی کۆمپیوتەر کۆتایی دێت جا بۆ ئەم مەبەستەش هەر لە رێگای ئەم گۆڤارە هەندێک بەرنامەی تایبەت بە چارەسەرکردنی کێشەکان یان چاودێریکردنی کۆمپیوتەرەکەت یان پاراستنی کۆمپیوتەرەکەت باس کراون و بەرنامەی زۆر گرنگ بوونە ئێستاش لەزنجیرەی ئەم بەرنامانە دێین باسی بەرنامەی ACE OPIMIZER UTILITES کە بریتیە لە بەرنامەیەکی تایبەت بە سرینەوەو پشکنینی کۆمپیوتەر لە فایلی سیخوری و فایلە بێ سودو پشکنینی سیستەمی کۆمپیوتەر لە هەڵە و لە نەمانی فایلی سیستەم و چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمپیوتەر بەگشتی. ئەم بەرنامەیە کارکردن تێیدا زۆر ئاسانە چوار فەرمانی سەرەکی هەیە. لە فەرمانی (CLEAN UP)کە یەکێکە لە چوار فەرمانە گرنگەکانی ئەم بەرنامەیە



وێنەی (٣)

ڕەش کردنەوەی مەلەفاتی بێکەڵکی ناو کۆمپیوتەر دووەمیان پاک کردنەوەی سیستەم و سێیەمیان سرینەوەو پاک کردنەوەی هیستۆری و چوارەمیشیان چارەسەرکردنی کێشە نادیاریەکانی کۆمپیوتەر. کارکردنیش لەم بەرنامەیە بەم شێوەیە دەبێت : وێنەی (١) بریتیە لە ڕوکاری بەرنامەکە لەم زنجیرەدا تەنها باسی فەرمانی (CLEAN UP) دەکەین کە ئەویش چوار فەرمانی تری هەن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی یەکەم کە بریتیە لە (REMOVE JUNK FILE) وەک لەوێنەی (١) دیارە تایبەتە بە لابردنی فایلی بێ سود لە ناو کۆمپیوتەر بەبێ ئەوەی مەترسیان هەبێت لە لەناوچونی فایلی بەسود بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە کلیک لەسەر دەکەین بۆکسێکی تر دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی (٢) بۆ دەست پێکردن کلیک لە سەر (SCAN) دەکەین بەمەش راستەوخۆ بەدوای هەموو ئەو فایلانە دەگەڕێت کە زیادن یان ئامادا کراون بۆ فڕێدان دەیاندۆزێتەوە دوایی بۆکەسێک دێت داوات لێدەکات کە ئەم فایلانە رەش بکەینەوە بڕوانە وێنەی (٣). بۆ فەرمانی پاک کردنەوەی سیستەم هەمان هەنگاو پەیڕەو دەکەین بەڵام بۆ فەرمانی ERASE YOUR HISTORY واتە سڕینەوەی هیستۆری. ئەوا دوای کلیک کردن بۆکسێک دێت وەک لەوێنەی (٤) دیارە داوای دەست نیشان کردنی بەشە سەرەکیەکانی کۆمپیوتەرت لێدەکات کە بیانسڕیەوە پاشان کلیک لەسەر (START) دەکەین بەمەش واباشترە دەست کاری هەڵبژاردەکە نەکەین تا تەواوی هیستۆری کۆمپیوتەر پاک دەکاتەوە. دوایی بۆکسێک دێت بە (YES) هەڵدەبژێرین، دوایی کۆمپیوتەر ریستارت دەبێت. دوا فەرمان کە بریتیە لە چارەسەری و فیکس کردن هەمان هەنگاوەکانی فەرمانی یەکەم و دووەمە.



وێنەی (٤)

# چی دەکەیت ئەگەر بەهۆی ڤایرۆس کۆمپیوتەرەکەت کوژایەوە؟




هێدی کامەران

گومان لەوە دانیە کە ڤایرۆسەکان بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەریان هەراسان کردون و ئەوانەی کە شارەزایەکی تەواویان لەسەر ڤایرۆسەکان نیە توشی کومەڵێک گرفت دەبن . یەکێک لە ڤایرۆسەکان دەبێتە هۆی توش بوونی کۆمپیوتەر بە پەتای کوژانەوەیە، بۆ ئەوەی لەم پەتا کوشندەیە رزگارمان بێت پێویستە کە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە پەیرەو بکەین . واتە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە لەرێگای دۆسەوە دەبێت وە ئەم کردارە تەنها بۆ ئەو کومپیوتەرانەیە کە توشی ئەم ڤایرۆسەوە دەبێت . لەرێگای فەرمانی (RUN) دەچینە سەر DOS PROMT ئەویش بە نوسینی (CMD) لە فەرمانی (RUN) دوایی کلیک لەسەر (OK) دەکەین ئینجا لە فەرمانی دۆسدا دەنوسین (SHUTDOWN -A) دواتر کلیک لەسەر (ENTER) دەکەین بۆ زیاتر رونکردنەوە پیتی (A) کە کورتکراوەی (ABORT) واتا فەرامۆش کردن واتە ئەو نامەیەی پابەندە بە کوژاندنەوەی لە ناکاو فەرامۆش دەکرێت . بەمەش کوتایی بە کاری ئەم ڤایرۆسە دێت و کومپیوتەرەکەت رزگاری دەبێت.



# خاڵە جیاوازیەکانی نێوان ترۆجان و کرمەکان و ڤایرۆس

بەیان بەختیار

بەردەوام من تێبینی ئەوەم کردووە کە تێکەڵکردنی ئەم زاراوانە لە ناو ئەو کەسانەی کەوا کۆمپیوتەر بەکار دەهێنن زۆرەو تاکو ئێستاش بەشێکی زۆر کەس بەتەواوەتی زانیاریان لەسەر کارو فەرمانی ئەم سێکوچکەیە نیە . بەڵام هەرسێکیان لەیەک فەرمان خۆیان دەدۆزنەزە ئەویش زیان گەیاندنە بە کۆمپیوتەر . بۆ ئەوەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر لە کوردستان زانیاریان هەبێت لەسەر ئەم سێ تێکدەرە و هەریەکەیان بەپێی مەوداو سنوری خۆیان لەزیانیان بگەین وە بەپێی مەترسیەکەیان بتوانین خۆیان لێ بپارێزین .

با لە ڤایرۆسەکان دەست پێبکەین: بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە چونکە هەمان کارو هەمان سیفەتی ڤایرۆسی مرۆڤی هەیە بەهەمان شێوە لە کۆمپیوتەرێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر، ڤایرۆسەکان خۆیان بە بەرنامەکان یان هەر فایلێکی کۆمپیوتەر بێت ئەلکێنن و بلاو دەبنەوە . لەناو هەموو کۆمپیوتەرێک بەنهێنی کاردەکەن و زیان و مەترسیەکانیان لە ڤایرۆسێک دەگۆرێت بۆ ڤایرۆسێک هەندێک لەم ڤایرۆسانە تێکچونی بچوک یان لەکارخستنی بەرنامەیەک کوتاییان دێت بەلام هەندێکیان دەبێتە هۆی لەکارخستنی سیستەم و تێکچونی هاردوێر تا دەگاتە فایلە گرنگ و تایبەتەکان . بۆ زانیاری زیاتر ئەم ڤایرۆسانە فایلەکانی پاشبەندی (EXE)ن واتە لەجۆری فایلە جێبەجێکاریەکانن تاکو خۆت دایان نەبەزێنیتە ناو سیستەم کارناکەن وەکو لای هەموومان زانراوە کە ئەم ڤایرۆسانە لەخۆیانەوە توشی کۆمپیوتەر نابن بەشێوەیەکی گشتی یان لەئەنتەرنێتەوە یان لەبەرنامەکان دەبێت..

کرمەکانیش هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان نیە لەگەل ڤایرۆسەکان بەتایبەتی لە شێوەی دروست کردن و نەخشەی بەرنامەکانیان بەلام لقێکی بچوکی ڤایرۆسەکانە بەلام پڕ مەترسیترین جۆریانە جیاوازی نێوان ڤایرۆس و کرمەکان بریتیە لەبلاوبونەوەیان واتە کرمەکان بەبێ داواکردن و دەستکاریکردن و ئاگایی بەکارهێنەر لەناو کۆمپیوتەر بڵاودەبنەوە، مەسەلەیەکی تر لەم کرمانەدا بریتیە لە خۆ لەبەرگرتنەوە واتە خۆکۆپی کردن و وەدوایی ناردنی بۆ کۆمپیوتەرێکی تر وە ئەم کرمانە کێشەی گەورە دروست دەکەن بەتایبەتی لەکاتێک کە خۆیان کۆپی دەکەن زۆربەی جار داوای پەیوەندی کردن دەکات بەسەنتەرە نێردراوەوە بۆ تەواوکردنی خۆکوپی کردن بە بێ ئارەزوی خۆت. ئەم کرمانە خاسیەتێکی زۆر مەترسی داریان هەیە بریتیە لەناردنی ئەم کرمانە لەکۆمپیوتەری خۆتەوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەلیستی پۆستی ئەلیکترۆنی تۆدا هەن لەوێش خۆیان کۆپی دەکەن و بەهەمان شێوە بۆ چەند کەسێکی تر وە بەم شێوە تادێت کارەساتەکە گەورە دەکەن . مەترسیدارترین ئەم کرمانە بریتیە لە کرمی بلاستر کە دوای چالاک بوونی دەبێتە هۆی کردنەوەی رێگە دان بە چەند کەسێک بۆ دەست بەسەراگرتنی کۆمپیوتەرەکەت و تەحەکوم پێکردنی ...

ترۆجانەکان لە بابەتێکی گۆڤاری کۆمپیوتەر باسکراوە بەلام منیش هەندی لایەنی دەردەخەم، ئەمانە زۆر جیاوازترن لە ڤایرۆس و کرمەکان بەشێوەیەک کە وا دروست کراون زیاتر زیان بە بەکارهینانی کۆمپیوتەر بگەینن و بێزاریان بکەن. ڕێگای بڵاوبونەوەشیان لەرێگای ئەنتەرنێتەوە دەبێت کاتێک لە ماڵپەرێکی نەناسراوەوە داوای دابەزاندنی بەرنامەیەکت لێدەکات و توشی داوەکە دەبیت . ترۆجانەکان هەندێکیان هەندی فایلی سەر دیسک تۆپ رەش دەکەنەوە لەگەڵ فایلەکانی سیستەم و هەندی فایلی گرنگی ناو کۆمپیوتەرەکەت لەگەڵ ئەمەشدا هەڵدەستێت بە گواستنەوەی فایلەکانی تۆ بۆ خاوەنی ترۆجان بەبێ ئاگاداری تۆ .

تێبینی نا بۆ ئەوەی ریکلام بۆ ئەم دژە ڤایرۆسە بکەم بەڵا بەهێزترین دژە ڤایرۆس بریتیە لە کاسپەر سکای.







وێنەی (١)

**نوسینی: ئاکۆ**
danahawllery@yahoo.com

**١- ڕێگایەکی خێرا بۆ کوژانەوەی کۆمپیوتەر:**

زۆر ڕێگا هەیە بۆ کوژانەوەی کۆمپیوتەر بەڵام ئەگەر ویستت کۆمپیوتەرەکەت بکوژێنیتەوە بەبێ بەکارهێنانی ماوس یاخود کیبۆرد ئەوا تەنها یەکجار پەنجە بنێی بە دوگمەی (POWER)ی کێس،ئەوا کۆمپیوتەرەکەت دەکوژێتەوە!.

**٢. کردنەوەی درایڤەکانی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی خێرا:**

پاش چونە ناو ئایکۆنی (MY COMPUTER) و دەبڵ کلیک کردن لەسەر هەر درایڤێک ئەوا ئەم درایڤە دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر

وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

تۆ ویستت بەڕێگایەکی خێراتر بچیتە ناو درایڤەکان ئەوا لەناو (RUN) دا سەرەتا ناوی درایڤەکە و پاشان دانانی دووخاڵی سەر یەکتر (:) ئەوا راستەوخۆ درایڤەکە دەبێتەوە بۆنموونە بۆ کردنەوەی درایڤی (C) ئەوا لە ناو (RUN) دا بنووسە (:C)،ئەم رێگایە باشە بۆ کردنەوەی فلۆپی دیسک بەشێوەیەکی خێرا! (وێنەی ١).

**٣- پاککردنەوەی کۆمپیوتەر لە فایلە زیادەکان:**

کارکردن و دابەزاندنی بەرنامەکان لەسەر کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی ئەنتەرنێت دەبێتە هۆی دروستکردنی فایلی کاتی لەناو کۆمپیوتەرەکەمان لەبەر ئەوە هەندێ جار زۆربوونی ئەم فایلانە دەبێتە هۆی هێواش بوونەوەی کۆمپیوتەرەکەو گرتنی روبەرێکی زۆر لە هارد، لەبەر ئەوە پێوستە بۆ هەفتەی جارێک هەڵسین بە پاککردنەوەی کۆمپیوتەر لەو فایلە زیادانە،فایلە کاتیەکان چەند جۆرێکن وە لەناو فۆڵدەرەکانی (TEMP،PREFETCH،RECE %NT،%TMP) دان،بۆ رەشکردنەوەی ئەم فایلانە لەناو (RUN) دا ناوی هەریەکەیان بە جیا بنووسە پاشان رەشیان بکەوە، (وێنەی ٢).

**٤- ناونانی فۆڵدەر یاخود فایل بەبێ ناو:**

ئەگەر ویستمان فۆڵدەرێک یان فایلێک بە بێ ناو، ناوبنێن ئەوا سەرەتا فایلەکە یان فۆڵدەرەکە دیاری دەکەین،پاشان (F2) سەر کیبۆرد دادەگرین بۆ ناو گۆڕینەکە دواتر (ALT) دادەگرین لەگەڵ ژمارەکانی (0160) بەیەکەوە، واتە (ALT + 0160) دابگرە بۆ ناولێنانی فۆڵدەرەکە.

**٥- داخستنی کۆمەڵە فۆڵدەرێک یاخود فایلێکی کراوە بەیەکەوە:**

زۆرجار دەبینین کەوا لەسەر روبەری (TASKBAR) ژمارەیەکی زۆر لە فایل و فۆڵدەر و بەرنامەکان کراونەتەوە لەبەر ئەو بۆ داخستنی ئەمانە پێویستە یەکە یەکەیان دابخەین بەڵام رێگایەکی تر هەیە کە دەتوانین هەڵسین بەداخستنی هەموویان بەیکەوە،سەرەتا کلیکی (CTRL)ی سەر کیبۆرد دابگرەو دەست لەسەری هەڵ مەگرەو پاشان بە ماوس کلیک لەسەر هەموو فایل و فۆڵدەر یاخود بەرنامەکان بکە دواتر لەسەر یەکیان کلیکی لای راست بکە وە کلیک لەسەر (CLOSE GROUP) بکەو ئەو بەرنامانەی کەکارت لەسەر کردوون وە خەزنت نەکردوون ئەوا داوات لێدەکات کە خەزنیان بکەیت، (وێنەی ٣).

# چوار شێوەی گواستنەوەی فلیم بۆ ناو کۆمپیوتەر

نوسینی: هاوکار عبدالقادر محمود

**پێشەکی**

فلیمی سەرکاسێت نزیکەی چەند ساڵێک دەمێنێ ودواتربێکەڵـک دەبێت بۆئەوەی فلیمەکانتـان پاش ئـەو ماوەیە نەفەوتێن باشترە هەرلەسـەرەتاوەبیکەنە دیجیتاڵ ولەفەوتانی هەمیشەیی بیپارێزن.

بۆ ئەو مەبەستە دەیانگوێزیتەوەبۆناوک کۆمپیوتەرەکەت خاڵێکی ئەرێیی تریشـی ئەوەیـە کەدەتوانی دوایـی گۆرانکارییان لەسەر بکەی یان هەندێک کرتەی ببڕی.

**<u>چـوار شـێوەی گواسـتنەوەی فلیـم بـۆ ناوکۆمپیوتەر</u>**

١- (کـارتـی گـرافـیـک GRAPHIC CARD) یـان (تـەخـتـەی سـەرەکـی MOTHERBOARD):




وێنەی (١)

هـێـنـدێـک لـەتـەخـتـەی سـەرەکـی کۆمپیوتەرەکانی گرافیک وەها دروست کـراون کـەمـرۆڤ بـتـوانـێ شـەپۆلـی ئەنالۆگیان لێوە تێپەڕێنێ ئەم جۆرەکارتانە دەبنـەهـۆی پێکهاتنی پـێوەندی لەنێو کۆمپیوتەرەکەو شەپۆلە ڤیدیۆییەکاندا کـە زۆربـاش نـین پاڵـەپەستۆیەکی زۆریـش دەخـەنـەسـەر پرۆسـێسـەری کۆمپیوتەرەکەش لەبەرئەوەی بەرێگەی دەنگەکانیش لەجۆرێکی نەگوشراودان و چووکەش نەکراونـەتەوە هـەر بۆیە جێگایەکی زۆردەگـرن وخێرامێشکی کۆمپیوتەرەکە پڕدەکەنەوە، (وێنەی ١).

٢- ڤـیدیـۆ باکـسـێکی دەرەکـی (EXTERN BOX):

ئـەم جۆرەباکسـانە گرێدانەکانیـان بە کۆمپیوتـەرەوە لەرێگـەی (USB) وەیـە و هەربۆیـە بەکارهێنانیان زۆر ئاسـانە ئەم جۆرەباکسـانە بەگشتی چەند ئەلتەر ناتیڤیـان بۆ ناردنـی شـەپۆلی ڤیدیۆیی بۆنێـو کۆمپیوتـەر هەیـە یەکێـک لـەو




وێنەی (٢)

ئەلتەرناتیڤانە (S-VIDEO) یە کەدەبێتە هۆی گواستنەوەی شەپۆلەکان بەجۆرێکی زۆرباش (واتە زۆر لەچۆنیەتی فلیمەکە کەم ناکاتەوە) بۆناوکۆمپیوتەر.

زۆربەی ئەو ڤیدیۆ باکسانەی کە ئیمرۆ لەبازاڕدا دەست دەکەون جۆری برگەی (MPEG) دەناسنەوە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوە کەبرگەکان لەچاو ئەوانەی پێشویاندا شوێنێکی زۆر لەکۆمپیوتەرەکەدا بخۆیانەوە تەرخان ناکەن، (وێنەی٢).

٣- (کارتی سەتەلایت SATELLITE CARD):

کارتی سەتەلایتی جیاوازیەکی لەگەڵ ئەوانەی پێشتر باسم کرد هەیە ئەویش ئەوەیە کەهەموونەوبەرهەمە ئامادانەی کەلەسەر سەتەلایت بڵاودەبنەوە و بەخۆڕایی دەکەونەبەردەست مرۆڤ وچاویان لێدەکرێ دەتوانی هاوکات وراستەوخۆش تۆماربکرێن لەبەرئەوە پێویست نییە بەردەستمان نیە ئامادەکراون، (وێنەی ٣).




وێنەی (٣)

٤- (کارتی فایروایەر FIREWIRE CARD):

ئەم کارتەش وەک کامیراکانی دی ڤی (DV) دەتوانی شەپۆلی ڤیدیۆیی بۆدەرەوەبنێری ئەگەر مرۆڤ کارتێکی وەهای لەکۆمپیوتەرەکەیدا هەبێت ئەوادەتوانی بەبی ئەوەی لەچۆنیەتی فلیمەکە کەم بێتەوە لەکۆمپیوتەرەکەیدا بیانکا بەدیجیتاڵ .

بێجگە لە کاری گواستنەوەی شەپۆلی ڤیدیۆیی مرۆڤ دەتوانی ئەم کارتە بۆ پەیوەندیەکی خێرای نێوان کۆمپیوتەرەکەی و هارد دیسکێکی



وێنەی (٤)

# وریابە لەکاتی بەکارهێنانی ctrl+c...

**ئەرخەوان فتاح**
**زانکۆی سەلاحەدین-زمانی ئینگلیزی**

هەمومان لەکاتی کارکردنماندا لەسەر کۆمپیوتەر بەتایبەتی بۆ ئەنتەرنێت کورتەڕێگە(شۆرت کەت)بەکاردێنین بەتایبەتی کۆپی کردن CTRL+C و پەیست کردن CTRL+V، ئێستاش با زانیارییەکە بخەینە ڕوو: بە دارشتەی زمانەکانی وەک JAVASCRIPT و ASP هەندێک لە پێگەکان دەتوانن ئەوەی کە کۆپیت کردووە لەسەر شاشەکەت چ نوسین بێت یان پاسۆرد(ووشەی تێپەڕین)یان ژمارەی چەکی بانکی...بێت تۆماربکەن

دەتوانن بۆ دڵنیا بوون لەوەی وتم خۆتان ئەم کارە بکەن بەم شێوەیەی خوارەوە:

لەسەرەتادا هەر دەقێک کە خۆت پێتخۆشە لابیەو هەستە بە کۆپی کردنی CTRL+C،پاشان بچۆ بۆ ئەم ماڵپەڕە لەوێدا بە پەیست کراوی دەیبینیتەوە HTTP://WWW.FRIENDLYCANADIAN.COM/APP...S/CLIPBOARD.HTM بۆیە بەڕێزان وریابن لە هەڵە بڵاوکردنەوەی زانیارییە تایبەتی وگرنگەکانتان بە تایبەتی ئەوانەی کە چالاکی کڕین وفرۆشتن وکاری بازرگانی وکۆمپانیا لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە ئەنجام دەدەن.

چارەسەری ئەمەش زۆر ئاسانە کە بەم شێوەیەی خوارەوە ڕونی دەکەمەوە:

1-IN INTERNET EXPLORER. GO TO TOOLS -> INTERNET OPTIONS -> SECURITY

2-CLICK ON CUSTOM LEVEL

3-IN THE SECURITY SETTINGS. CLICK TO DISABLE THE "ALLOW PASTE OPERATIONS VIA SCRIPT." THAT WILL KEEP YOUR CLIPBOARD .CONTENTS PRIVATE

# لابردنی پرۆگرام لە RUN دا

باوکی ماریا – شەقلاوە
Kameran760@hotmail.com

وەکو دەزانین کاتێک بمانەوێ بەرنامەیەک لابەرین لەسەر ئامێرەکەمان ئەوا دەچینە سەر بەشی UNINSTALL ی بەرنامەکە، بۆ لابردنی بەرنامەکە، بەلام هەموو بەرنامەیەک ئەم تایبەتمەندییەی نییە، بۆ لابردنی ئەو پرۆگرامانەی کە




وێنەی (١)

ئەم تایبەتمەندییەیان نییە دەچین بۆ CONTROL PANEL وە هەڵبژاردنی ADD/REMOVE PROGRAM وە لەوێدا بەرنامەکە هەڵدەبژێرین وە لای دەبەین، بەلام دیسان هەندێ لەبەرنامەکان لە ADD/REMOVE نابینرێن یاخود ناسڕێنەوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە هەڵدەسین بەلابردنی ئەم پرۆگرامە لەبەشی REGISTRY لە ویندۆز بەم شێوەیە .

لە لیستی START دەچین بۆ RUN وە فەرمانی REGEDIT دەنووسین وە OK دەکەین، پاشان لەلای چەپی شاشەی ڕیجیستری دەچینە سەر ئەم کلیلە ( وێنەی ژمارە ١) .

HKEY_LOCAL_MACHINE
SOFTWARE
MICROSOFT
WINDOWS
CURRENT VERSION
UNINSTALL

دەبینین هەموو پرۆگرامەکان دەردەکەون کە لەسەر ئامێرەکەدا هەن، ئێستا هەر بەرنامەیەکمان ویست بیسڕینەوە کلیکی لای ڕاستی ماوسی لەسەر دەکەین وە DELETE هەڵدەبژێرین (وێنەی ژمارە ٢) .




وێنەی (٢)




# چۆن دەتوانین وێنەیەک لە پارچە ڤیدیۆیێک وەربگرین

ئا: ڕێدار کامەران

بەڕێزان زۆر جار ئێمە سیدییێکی ڤیدیۆیی دەخەینە سەر کۆمپیوتەر دەمانەوێ چەند وێنەیـەک لەو سـیدیە دەر بهێنین بۆئەم کارە زۆر بەرنامە هەیە ئەم کارە ئەنجام دەدەن بـەلام پێویسـت بەبەرنامە ناکات ئەگەر بمانەوێ بەخێرایی وێنەیەک بگرین ئەوا سیدیەکە بەمیدیا پلەیەر بەکاردێخین ئینجا کۆنترۆل ئـای دادەگرین بەکیبۆرد راسـتەو خۆ لیستێکمان دێنێتە پێش چاو دەڵێت وێنەکە لەکـوێ هەڵدەگریت تۆش ناوێکی یاخـود ژمارەیەکە بۆدادەنێیت و لە هاردێک هەڵی دەگرێ.

# چۆنیەتی گۆرینی دەنگەکانی کۆمپیوتەر




ئا: شاخەوان

بەڕێزان ئێمەی کورد وەک میلەتانی جیهان حەزبە شتی خۆمان دەکەین وەک چۆن ویندۆز بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی و ئیتر هەیە ئێمەش حەزدەکەین ویندۆز بەزمانی خۆمان بدوێ ئەمەش لەلایەن چەند پرۆفیسۆرێک کە ئێستاش کاری بۆدەکرێت دوارۆژی بۆ هەموومان دیاریکراوە بەڕاستی شتێکی خۆشە بەڵام ئێمە ئەگەر بێت و خۆمان حەزبکەین دەنگەکانی ناو کۆمپیوتەرەکانمان بەکوردی پێمان بڵێت ئەم کردارە زۆر ئاسانە هەمو ئەو دەنگانەی کەلەکاتی هەڵکردن و داخستن و کردنەوەو هەرکارێکی تر هەموو ئەو دەنگانە لەناو فایلی ویندۆز هەروەها لەناو ویندۆز میدیاش داهەیە ئەگەر بێتو ئێمە دەنگێک بە مایک تۆمار بکەین بۆناو کۆمپیوتەرەکانمان پاشان ئەو دەنگە ببەینە ناو ویندۆز لەوێوەش بیبەینە ناو فایلی میدیا لەوێ کۆپی بکەین لەناو فایلی میدیا ناوی یەکێک لەدەنگەکانی ناو ئەو فایلە کۆپی بکەینە سەرئەو دەنگەی کەخۆمان تۆمارمان کردوە پاشان دەنگە سەرەکیەکە بسڕینەوە پاشان دەبینین دەنگەکەی ئێمە دامان ناوە جێی ئەو دەنگە سەرەکیە دەگرێتەوە بەم شێوەیە دەتوانین نیمچە ویندۆزەکی کوردی دروست بکەین.

# هەنگاوەکانی قوتابیان لەگەڵ تەکنەلۆژیای سەردەم

**گومان لەوە دانیە کە توێژی قوتابیان نەوەی دوارۆژی وولاتن هەروەها توێژی بنیاتنەرن بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامیان. بۆیە لەگەڵ ئەم چەرخەدا کەچەرخی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیایە ئایا توانیویانە رۆڵی خۆیانی تێدا بگێرن؟ ئایا قوتابیانی ئێمە بەتایبەتی ئەو قوتابیانەی تایبەتمەندن بەبەشی کۆمپیوتەر تاچەند ئەم زانستە بۆ بۆ بەرەو پێش بردنی وولات بەکار دەهێنن ؟ یاخود بۆ چ مەبەستێک ئەم چەکی سەردەمە بەکار دەهێنن ؟ بۆ ئەم مەبەستە سەردانی بەشی سیستەمی کۆمپیوتەری پەیمانگای تەکنیکی هەولێرمان کرد بۆ ئەوەی لەنزیکەوە لە پرۆژەکانیان ئاگاداربین.**

**ڕیپۆرتاژو فۆتۆ: ڕێناز ئەردەلان بەکر**



**سەرەتا بەرێز مامۆستا شلێر عەزیز گەلالی یاریدەدەری راگر لەکۆلێژی تەکنیکی دەڵێت:**

پرۆژەی من پرۆژەی دروست کردنی داتا بەیسە بۆ یەکەی قوتابیان لەکۆلێژی تەکنیکی لەبەر ئەوەی کومپیوتەر ئێستا لەهەموو شوێنێک و ماڵێکە، باشترین ئامێرەو ئاسانکاری زۆرمان بۆ دەکات بە تایبەتی لە بارەی کارو باری قوتابیان. بۆیە پێویستیمان بە دروست کردنی (داتابەیس) هەبوو بۆ کولێژەکەمان ئێمەش هەستاین بە پێشکەش کردنی ئەم پرۆژەیە بۆ بەشی سیستەمی کومپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر . من وەک سەرپەرشتیاری ئەم پرۆژەیە وادەبینم کە ئەم پرۆژەیە سەر کەوتوو دەبێ وە سودی لێ وەردەگیرێ بۆ یەکەی قوتابیان ئاسانکاری باشمان بۆ دەکات بۆ نمونە ئەگەر بێت و بمانەوێ ناوی قوتابیانی دەرەوە یاخود ناوەوەی شار بزانین یان ئەو قوتابیانەی بە پلەی بەرز دەرچوون یاخود هەر زانیاریەکمان بوێت لە بارەی قوتابی دەتوانین لە رێگای ئەو پرۆژەیە دەستمان بکەوێت .ئامانجی سەرەکیشمان لە ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە ئەوەیە کە کاتێ قوتابیانمان دەردەچن ئەکادیمین بۆیە دەمانەوێت بەهۆی جێ بە جێ کردنی ئەم پرۆژانە لە کردارە عەمەلیەکان نزیکیان بخەینەوە .

**قوتابی ڕەشاد دڵشاد قۆناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەڵێت :**



ئێمە وەک قوتابیانی قۆناغی دووەم هەڵدەستین بە ئەنجامدانی پرۆژەیەک بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری قوتابیان هەر لە پەیمانگاکەی خۆمان . پرۆژەی ئێمە هەڵسوڕاندنی کاروباری قوتابیانە بۆ هەر هەموو بەشەکانی پەیمانگا تەکنیکی، کە چۆن بەش بەش زانیارییەکان لە ناو پرۆژەکان ڕابکێشن و سودی لێ وەربگرن لەم پرۆژەیەش ئامانجمان ئەوەیە بەهۆی کومپیوتەرەوە ئاسانکاری لە هەڵسوڕاندنی کاروباری قوتابیان بکەین. مامۆستای تایبەت هەیە وەک سەر پەرشتیاری پرۆژەکە وە بەشەکەشمان ئاسانکاریمان بۆ دەکەن بەڵام کارە سەرەکیەکە دەکەوێتە سەر ئەستۆی ئێمەی قوتابی .

**قوتابی شەنگین ڕەسول قوناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەڵێت:**



پرۆژەی ئێمە لەسەر کاروباری قوتابیانە هەڵدەستێت بە پێشکەش کردنی خزمەتێکی بچووک بۆ پەیمانگا کەمان .

ئێمەش بە هاوکاری لەگەڵ مامۆستایان ئەو پرۆژەیە وەک ئاسانکاریەک بەکار دەهێنین بە تایبەتی بۆ داهاویشتە ناوی قوتابیان ئەمەش یارمەتی دەرێکە بۆ ون نەبوونی فایلی ناوی قوتابیان .

**قوتابی کارزان حمدامین قوناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر گوتی:**



پرۆژەی ئێمە لە سەر دانانی (ویب سایت) ە بە بەکار هێنانی (PHP) ئەو ویب سایتەش بۆ ئەوەیە کە بتوانین بە داتا بەیس زانیاری داخیل بکەین و هەروەها، ئەو سایتە هەڵدەستێ بە لە خۆ گرتنی هەموو ئەو کەل و پەل و ئامێرانەی کە تایبەتن بە کۆمپیوتەر لەگەل دەرخستنی نرخی کۆمپیوتەر ئەویش بچێت لە ئەنتەرنێت پەخشی بکات . مامۆستاکانمان ئاسانکاری زۆریان بۆ کردوین پرۆژەکەشمان تا ئێستا بەرەو کۆتایی دەچێت ئامانجی سەرەکی ئێمە خزمەت کردنی قوتابیان و ئەو مامۆستایانەن کە لە بواری کۆمپیوتەر شارەزان .

**قوتابی محمد عبدالخالق قۆناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر گوتی :**



پرۆژەی ئەمسالمان بە هاوکاری قوتابیان و مامۆستایان هەستاین بە دروست کردنی پرۆژەیەک لە بارەی کاروباری قوتابیان وە ئاسانکاری و بۆ خزمەت کردنی ئەو قوتابیانەی کە لە دوای ئێمەوە دێن، هەروەها فێر بوون و زانیاری بەخشین لە بارەی بەرنامەی(ئەکسس). سودی ئەم پرۆژەیەش هەم بۆ خۆمانە کاتێک دەردەچین و لە دام و دەزگاکان دادەمەزرێن بۆ ئەوەی زانیاری باشمان هەبێت و بتوانین خزمەت بە وولاتەکەمان بکەین هەروەها بۆ ئەوەی قوتابیانی دوای ئێمەش سوودی لێ وەبگرن .

**قوتابی شەهلا یونس جمیل قوناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەلێت:**

پرۆژەی ئێمە دانانی بەرنامەیەکی کارە بۆ بەڕێوەبردنی کۆگای سەرەکی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر بۆ ئەوەی کاروباری کۆگا ئاسان بکەین هەروەها بتوانین بەم هەنگاوە بچوکانە خزمەت بەخاک و نیشتمانەکەمان بکەین .



**قوتابی ساکار نوری مستەفا قوناغی دووەم بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر گوتی:**



پرۆژەی ئێمە دانانی (ویب سایت)ە بەبەکارهێنانی داتا بەیس بەزمانی (PHP)· سایتەکەمان کارەکەی ئەوەیە نرخی کۆمپیوتەرەکانی شاری هەولێر بەهەموو جۆرەکانیەوە بەدیار بخات ئەمەش وەک ئاسانکاریەک وایە بۆ ئەو کەسانەی بازرگانی بە ئامێری کۆمپیوتەر دەکەن یاخود بۆ کەسێک بیەوێت بەر لەکرینی ئەم ئامێرە نرخەکەی بزانێ. بۆیە ئێمەش وەک قوتابیەکی کورد پێمان خۆشە بەم پرۆژانەمان خزمەت بەخاک و نیشتمانەکەمان بکەین.

# ئەنتەرنێت هیچ مەترسیەکی نیە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو کەسانەی کە بەکاری دێنن

ئەندازیار زهره حسن محمد
zahrahassan2004@yahoo.com




لە کاتێکی دیاریکراودا هەندی کەس وای دەبینی کە پێشکەوتنی جیهانی ئەنتەرنێت مەترسییەک دروست دەکات بۆ کومەڵ، هەروەها ئەنتەرنێت دەبێتە هۆی تێک دانی پەیوەندیەکان لە نێوان خێزان و برادەران و خزم و دۆست وە بەکارهێنەر دەبێتە کەسێک کونترۆڵ دەکرێ لە لایەن کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت.

بەڵام توژینەوەکانی ئەم سەردەمە کە نوێترین توژینەوەن وە لە رێگای بەڵگەی تازەو نوێ ئەوەی راگەیاند کە ئەو سیستەمە نوێیانەی کە لە ئەنتەرنێت دا هەیە وەکو (برید الکترونی وە پەیوەندی تەلەفۆنی لە ریگەی ئەنتەرنێتەوە هەروەها بەکارهێنانی کامیرای ئەنتەرنێت وە خزمەت گوزاری ناردنی کورتە نامە) ئەوا پەیوەندیەکانی نێوان خەڵکان و برادەران زیاتر و بە هێزتر دەکات.

هەروەها ئەو توژینەوانە ئەوەی دوپات کردەوە کە ئەو کەسانەی توشی کێشیەکی رۆژانە دەبن بە خێرایی رودەکەنە تۆرەکانی ئەنتەرنێت بۆ داوا کردنی یارمەتی، وە داوای یارمەتی دەکەن کاتی دەیانەوێ بەدوای ئیشێک یان وەزیفەیەک بگەرێن یان داوای چارەسەرکردنی کێشەکانیان بکەن. ئەمەش ئەوە دوپات دەکاتەوە کە ئەنتەرنێت ئەو فریشتە ترسناکە نیە کە خێزانەکان یان زانستە کومەڵایەتیەکان لێی بترسن بەڵکو پسپۆران وای دەبینن ئەگەر بمانەوێ پەیوەندی لە نێوان کەسانەوە بەهێزتربێت ئەوە زیاتر پێویستیمان بە برید الکترونی دەبێت بۆ مانەوەی ئەو پەیوەندیە لەگەڵ هەموان لە کاتێکدا توانای سەردانیانمان نیە بە بەردەوامی. هەروەها ئەنتەرنێت یارمەتیمان دەدات کەوا ئەو پەیوەندیانە لە یەک شوێندا نەبێت بەڵکو دەتوانین فراوانی بکەین کە هەموو جیهان بگرێتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی لە دوای ئەو توژینانەی کە لە وڵاتە یەکگرتووەکان کراوە زۆر کەسان رای خۆیان دەربریوە کە ئەنتەرنێت رۆڵێکی زۆر باشی هەبوە لە ژیانیان دا وەک بریاردانی مصیری یان هەڵبژاردنی قوتابخانەی گونجاو بۆ منداڵەکانیان یان هەڵبژاردنی شوێنی دانیشتنی گونجاو یان گەران بەدوای وەزیفە یان وەرگرتنی چارسەرکردن بۆ نەخۆشیەکانیان . لێرەدا نابێ ئێمە رۆلی ئەم ئامێرە مەزنە پشت گوێ بخەین بەڵکو دەبێ زیاتر سود لە خەسڵەتە جۆراو جۆرەکانی وەرگرین.

# بەکار خستنی خزمەت گوزاری تەلەفونی ئینتەرنێت لە پرۆگرامی Yahoo messenger دا




ئا: دیار عەزیز

لـە درێژەی هەنگاوە یەک لەدوای یەک و نوییەکانیـدا لـەم دواییـەدا کۆمپانیای (YAHOO) هەڵسـا بـە بەکارخسـتنی پەیوەندی تەلەفونـی لەڕێگای ئینتەرنێت بـۆ بەکار هێنەرانـی بەرنامەی (YAHOO MESSENGER) لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ئەمەش دوای سێ مانگ دێت لە ڕاگەیاندنی ئەم خزمەت گوزاریە .

جێی ئاماژە پێدانە ئەم خزمەت گوزاریە بەچەندین زمانی جۆراوجور دەستە بەر کـراوە کە ئەمەش ئارەزووی کۆمپانیاکە پیشـان دەدات بـۆ بەرفـراوان کردنـی پێگەی جەمـاوەری و ڕکابـەری کردنی کومپانیاکانی تـری ئەم بوارە بە تایبەتی کومپانیـای (SKYB) کە بـەم دواییە ئەم خزمـەت گوزاریـەی بەتێچونێکی کەم و تەکنەلۆژیایەکی پێشـکەوتوو خسـتبووە کار،بەم جـۆرە بەکار هێنـەران دەتوانن لەڕێگای ئـەم خزمەت گوزاریە (YAHOO MESSENGER WITH VOICE) پەیوەنـدی بکـەن بە هەر یەکە لـە تەلەفۆنی نۆرمال و گەڕۆک، بە هەمان شێوە بەکارهێنەران دەتوانـن بەهۆیەوە ژمارەیەکـی تایبەت وەربگـرن بەرامبـەر بەشـدار بوونـی مانگانەی (٣٠)$.

وە هەروەهـا بەکارهێنـەران دەتوانـن بەهۆی خزمـەت گوزاریەکـە پەیوەندی بکەن بە(٣٠)ولات بەجۆرێکی باش بە (٢) سەنت بو هەر دەقیقەیک،جگە لە پەیوەندی کردن بە (١٥٠) ولاتی تر لەسەرانسەری جیهان بە گوێرەی رادەی پێشکەوتوویی پەیوەندیەکان لەم وولاتانە.

جگە لەمەش ئەم خزمەت گوزاریە چەند تایبەتمەندییەکـی تر دەگرێتە خۆی وەکو خزمەتگوزاری نامەی دەنگ بە خۆڕایی.

سەرچاوە: بوابة العربية

# هەندێک لە سایتی ئەنتەرنێت بۆ فێربونی زمانی ئینگلیزی

ئا: دلۆڤان
(بەشی یەکەم)



**سایتی وەرگێر:**

HTTP://WWW.ALMISBAR.COM/SALAM_TRANS_A.HTML
HTTP://WWW.CIMOS.COM/TRADNET.HTM
/HTTP://TARJIM.AJEEB.COM/AJEEB

* * * *

**فەرهەنگی زمانی ئینگلیزی**

HTTP://WWW.ANGELFIRE.COM/BIZ/KHA98/...S/ENG/ENG1A.HTM

* * * *

**قاموس**

HTTP://WWW.M-W.COM/HOME.HTM
/HTTP://WWW.ONELOOK.COM

* * * *

**قاموسی تاکەکان**

/HTTP://WWW.WORDSMYTH.NET
/HTTP://WWW.THESAURUS.COM
/HTTP://WWW.ITOOLS.COM/LANG
/HTTP://WWW.BARTLEBY.COM/61

* * * *

**سایتێک بۆ فێربونی ووشەی تازە VOCABULARY**

/HTTP://SYNDICATE.COM
HTTP://WWW.GETTY.EDU/RESEARCH/TOOLS/
/VOCABULARY
/HTTP://WWW.SUPERKIDS.COM/AWEB/TOOLS/WORDS
HTTP://WEBSTER.COMMNET.EDU/GRAMMAR/
VOCABULARY.HTM

* * * *

**سایتێک بۆ فێربوونی ئاسان لەگەڵ روون کردنەوە**

HTTP://WWW.ENGLISHDAY.COM

* * * *

**سایتێک بۆ لەبەرکردنی ووشەکان و راهێنانی زمانی ئینگلیزی**

HTTP://WWW.ENGLISHLEARNER.COM

* * * *

**دەلیلێکی زۆر خێرا بۆ فێرکردنی سەرەتایی**

HTTP://WEBNZ.COM

* * * *

**سایتێک بۆ چاکسازی و ماناى ووشەکان**

HTTP://WWW.SOON.ORG.UK



# چاککردنەوەی کۆمپیوتەری برادەرەکەت لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە

ئامادەکردنی /ئازاد ساڵح نادر ڕواندزی
azad_sn@hotmail.com

بێ گومان ویندۆزی ئێکس پی ئەو سیستەمەیە کە پڕە لەو سیفەتە باشانەی کە لە ڤێرژنەکانی پێشوو تر نەبوو لە سیستەمی کار کردن تا دەگاتە جوانی ستایل و خێرایی و ئاسانی بەکارهێنانی و زوو ناسینەوەی پارچەکان .... هتد لەو سیفەتە باشانەی کە لەم ویندۆزە هەیە کە لە هی تر نیە لەگەل ئەوەی کە کون و کەلەبەری زۆرە بۆ چوونەناو ئەم ویندۆزە لە کاتی بەکار هێنانی ئینتەرنێت. بە هەرحاڵ یەکێک لە سیفەتەگرنگەکانی ئەم سیستەمە لێرەدا شی دەکەینەوە ئەویش چۆنێتی کۆنترۆل کردنی کۆمپیوتەرێک لە دووری یەوە بە تەنها بە بەکارهێنانی ماسنجر (MESSENGER) بە ئاسانی وەک لە خوارەوە باسی لێوە کراوە:

پرسیار کەلک لەم کردارە چی یە؟

وەلام / بۆ چاککردنەوەی کۆمپیوتەری برادەرەکەت لە دووری ئەو تو لەماڵی خۆتی ئەویش لە ماڵی خۆیەتی.

تێبینی /

١- ئەم ڕێگایە لەسەر ویندۆزی ئێکس پی کاری پێکراوە بەڵام دیار نیە لە ویندۆزەکانی تر کار دەکات یان نا .

٢-دەبێ لەلایەن تو وە یان برادەرەکەت جێ بەجێ بکرێت . باشتر وایە لە کۆمپیوتەری خۆت و برادەرەرکەت تەجروبەی بکەیت یان وەک وانەیەک بۆ برادەرکەت بینێری پیش جێ بەجێ کردنی .

٣- دەبێ تۆ و برادەرکەشت پەیوەندیتان بە تۆری ئەنتەرنێت هەبێت وە (ONLINE) بن واتە لەسەر خەت بن .

یەکەم جار تۆ لە لای خۆتەوە ئەم کردارانە دەکەیت:

١- بەکلیکی لای ڕاست دەچینە سەر (MY COMPUTER) لە (DESKTOP یان START MENU) .




وێنەی (١)

٢- (PROPERTIES ) هەڵبژێرە .

٣- لە سەر (REMOTE ) کلیک بکە . وەک لە وێنەی ژمارە (١) دا دیارە

٤- پرۆگرامی ( MSN MESSENGER) بکەرەوە .

٥ – کلیک لەسەر هەردوو ( ALLOW REMOTE ASSISTANCE INVITATION TO BE SENT) وە (ALLOW USERS TO CONNECT REMOTELY TO THIS COMPUTER بکە وەک لە (وێنەی ژمارە٢) دیارە، بکەووە هێمای/: دابنێ ئنجا دەچینە سەر کۆمپیوتەری برادەرەرەکەت / بۆ نمونە برادەرەکەمان ناوی (RAWA ) یە.

١- وەک ووتمان دەبێ برادەرکەت و خۆشت لەسەر ماسنجەری هۆتمایل بن

٢- داوا لە برادەرەکەت بکە کە لە ناو ماسنجەری هۆتمایل

بچێتە سەر لیستی (ACTION) وە (ASK FOR REMOTE ASSISTANCE) کلیک بکات وەک وێنەی ژمارە (٣) .

٣- لە ناو ماسنجەر ئەم نوسینەت بۆ دەنووسرێ (INVITING YOU TO START REMOTE ASSISTANCE .DO YOU WANTTO ACCEPT ( ALT + ) OR DECLINE (ALT +D) THE INVITATION

٤- تۆ دەبێ (خۆت نەوەک برادەرەکەت) کلیک لەسەر (ACCEPT) بکە .

٥- داوا لە برادەرەکەت بکە (OK) بکات لەسەر هەر نووسینێک لە کۆمپیوتەرەکەی دەردەکەوێ.

٦- پاش کەمێک چاوەڕوانی نوسینێک لە ناو چوارچێوەی (REMOTE ASSISTANCE) دەردەکەوێ (بۆ خۆمان لەناوی نووسراوە (ATTEMPTING CONNECT TO RAWA)

٧- پاش کەمێک شاشەی برادەرەکەت لە ویندۆیەکی کراوە بە ناوی ( REMOTE ASSISTANCE ) دا لە ناو ماسنجەر لەلای ڕاست دەبینی لەلای چەپیش جێگەی (CHAT) کردنەکەیە، بەڵام تۆ ناتوانی کۆنترۆڵی کۆمپیوتەری برادەرەکەت بکەی.

٨- دەتەوێ کۆنترۆڕی کۆمپیوتەری برادەرەکەت بکەی بڕۆ کلیک لەسەر (TAKE CONTROL ) بکە لە سەرەوەی لای چەپی پەنجەرەی ماسنجەرەکە .

٩- نووسینێک بۆ برادەرەکەت دەنووسرێ ئایا پەسندی دەکات یان نا.

١٠ - گەر پەسندی کرد تۆ دەتوانی دەست کاری کۆمپیوتەرەکەی ئەو بکەی چونکە هەموو ئایکۆنەکانی و دیسک تۆپ لە تۆ دیارە کلیکیان لەسەر بکە و بڕۆ بۆ ئەو شوێنەی کە پێویستە بۆ ی چاک بکەیتەوە .

١١- ئەگەر هەر کۆسپێک هاتە ڕێگا بڕۆ ماسنجەری ئاسایی کار پێ بکە (WINDOWS MESSENGER)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



# هەموو شتێک لە ئەنتەرنێت بدۆزەرەوە

ئەژین شێرکۆ
(بەشی یەکەم)

دەتەوێت لە ئەنتەرنێت بەدوای چیدا بگەڕێیت ئارەزوی چ دەکەیت ئەوا پێویستت بە ماڵپەڕەکانی گەڕان هەیە من لێرەدا هاوکار دەبم بۆ ئەوەی بتگەیەنمە ناو هەموو ئەو بزوێنەرانە کە تۆ ئارەزویان دەکەیت بۆ نمونە من ئارەزوی گەڕان بەدوای بەرنامەدا بکەم یەکێکی تر حەز دەکات زانیاری لەسەر ماڵپەڕەکانی تایبەت بە کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت پەیدا بکات بۆ ئەوەی بگەیتە هەرچی دەتەوێت بەدەستی بێنێت سەردانی ئەم سایتانە بکە:

### بەناوبانگترین ماڵپەڕەکانی گەڕان

www.altavista.com
www.search.aol.com
www.compuserve.com
www.directhit.com
www.euroseek.net
www.excite.com
www.alltheweb.com
www.findwhat.com
www.google.com
www.hotbot.com
www.looksmart.com
www.lycos.com
www.msn.com

## بەناو بانگترین ئەو ماڵپەڕانەی گەڕان بەدوای بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت دابین دەکەن

www.search.netscape.com
www.dmoz.org
www.overture.com

www.yahoo.com

www.32bit.com
www.download.com
www.freewarefiles.com
www.itprodownloads.com
www.lycos.com
www.programfiles.com
www.supershareware.com
www.tiklsoft.com
www.topfile.com
www.tucows.com
www.versiontracker.com
www.hotfiles.com

## بزوێنەرەکانی گەڕانی تایبەت بە سۆفت وێر

WWW.ACCESSMICRO.COM
WWW.AMAZON.COM
WWW.BEYOND.COM
WWW.US.BUY.COM
WWW.CDACCESS.COM
WWW.CDW.COM
WWW.CHUMBO.COM
WWW.COMPUTERS4SURE.COM
WWW.INDUSTRYBRAINS.COM
WWW.SOFT4U.COM

## بزوێنەرەکانی گەڕانی تایبەت بە هارد وێر

www.accessmicro.com
www.axiontech.com
www.beyond.com
www.us.buy.com
www.shopper.cnet.com
www.c-source.com
www.shop.compusa.com
www.computersısure.com
www.industrybrains.com
www.microson.ca
www.outpost.com
www.shoplet.com

www.techstore.com

## بزوێنەرەکانی گەڕانی تایبەت بە کۆمپیوتەر

WWW.AVPVE.COM
WWW.AVP.CH
WWW.SEARCH.CAI.COM
WWW.CSRC.NIST.GOV/CSRC/SEARCH.HTML
WWW.INFOWAR.COM
WWW.NEWORDER.BOX.SK
WWW.SECUREROOT.COM
WWW.SECURITYSEARCH.NET
WWW.SECURITYFOCUS.COM
WWW.SECURITYPORTAL.COM
WWW.SYMANTEC.COM
WWW.VIL.NAI.COM/VIL/DEFAULT.ASP
WWW.XFORCE.ISS.NET






# بەرنامەی (Google Mars) بۆ بینینی هەسارەی مەریخ!

## ئا: ڕێبین عەلی

پاش دەستەبەرکرن و خستنەکاری هەردوو بەرنامەی (GOOGLE EARTH) و (GOOGLE MOON) بۆ بەکارهێنەران بۆ بینینی شوێنەجیا جیاکان لسەر ڕووی زەوی و مانگ بەشێوەیەکی وورد و کارا، کۆمپانیای گوگل لەم دواییەدا هەڵسا بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری (GOOGLE MARS) بۆ بینینی ڕووی هەسارەی مەریخ . لەم بەرنامەیەدا کۆمپانیاکە پشتی بەو نەخشە و وێنانە بەستوون کە لەسەر ڕووی مەریخ گیراون لەدووری (٢٥٠)میل لەلایەن هەردوو کەشتی ئاسمانی (مارس گلۆبال سیرفۆر) و (مارس ئۆدیسی) کە ئەم دوو کەشتییە سەر بە ئاژانسی بۆشاییگەری ئەمریکی (ناسا)ن، ئەمەش پاش ئەو ڕێکەوتنە دێت کە لەلایەن کۆمپانیای گوگڵ و ئاژانسەکە مۆرکرا.

جێگای باسە بەکارهێنەر دەتوانێ بەهۆی ئەم بەرنامەیە هەسارەی مەریخ بەسێ شێوەی جیاواز ببینێ: یەکەمیان بریتییە لە نەخشەی بەرزاییەکان کە تیایدا ڕەنگی جۆراوجۆر بەکارهاتووە بۆ بینینی بەرزاییە جیاجیاکان.

دووەمیان نەخشەی وێنە بینراوەکان کە تیایدا ڕووی مەریخ نیشان دەدات بەهەردوو ڕەنگی سپی و ڕەش.

سێیەم و کۆتایی بریتییە لەو نەخشانەی بەهۆی تیشکی ژێر سوور دانراوون کە خۆی دەنوێنێ لەپلەی گەرمی شوێنە جیاجیاکانی مەریخ.

وەهەروەها بەکارهێنەر دەتوانێ بەئارەزووی خۆی وێنەکان نزیک بکاتەوە بۆ نیشاندانی بەرزی و نزمی سەر ڕووی مەریخ وەکو چیاکان و چاڵەکان...هتد.

بەهەمان شێوە دەتوانرێ لەڕێگای بەرنامەکە شوێنی و پێگەی کەشتییە ئاسمانیەکان وەکو (سپیرت و ئۆپەرتینیستی) ببینرێ کە لەسەر ڕووی مەریخ دانراون لەکۆتاییدا.

کۆمپانیاکە رایگەیاند کەوا بەکارهێنەر دەتوانێ لەڕێگەی سایتی (WWW.MARSGOOGLE.COM)یەکە بە یەکەی ئەو وێنانە ببینێ کە لەماوەی هەفتەیەکدا دەگەن بەتایبەتی پاش گەیشتی کەشتی ئاسمانی (ریکۆ نیسانس) بەخولگەی دیاریکراوی خۆی لە مەریخ.

سەرچاوە : سایتی ( الموسوعة العربية)



# ئایا تۆ وابەستەی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بوویت

و لە عەرەبییەوە: نازەنین ئازاد

تاقی کردنەوەیەکی سادەو ئاسان ئاخۆ ئایا تۆ وا بەستەی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بویت یان نا، ئایا شێوازی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لەلای تۆوە تەندروستە یان نا بۆ ئەم مەبەستە ئەم تاقی کردنەوەی خوارەوە ئەنجام بدەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی برۆ تا کۆتایی. لەگەڵ وەڵامی هەر پرسیارێک بە بەڵێ یان نەخێر وەڵام بدەرەوە و وەڵامەکان تۆمار بکە :

١- ئایا هەست بە ئازار دەکەیت لە خوارەوەی پشت و لە جومگەکانی ئێسکەکانی پەنجەی دەستەکانت و یان هەر پاڵەپەستۆیەکی تر لەکاتی هەڵدانەوەی پەڕەکانی ئەنتەرنێت؟

٢- ئایا ئارەزویەکی زۆرت هەیە بۆ بەکار هێنانی ئەنتەرنێت و بەشدار بونت لە تۆڕی ئەنتەرنێت ؟؟

٣- ئایا هەست بە چالاکی و گورج و گۆڵی دەکەیت لەکاتی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت ؟؟

٤ – ئەگەر هێڵەکەت پچڕا یان کارتی بەکارهێنانی ئەنتەرنێتت بڕا ئەوا دەمار گرژ دەبیت تا ئەو کاتەی هاوبەشی بەکارهێنان نوێ دەکەیتەوە یان ئامادەی زو کارتێکی تری بۆ بکڕی ؟؟

٥- ئایا ماوەی پێنج کاتژمێر لە سەر ئەنتەرنێت کار دەکەیت بە بەردەوامی یان بە پچڕ پچڕی لە ماوەی یەک رۆژدا؟؟

٦ – ئایا بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بوەتە هۆی فەرامۆش کردنی کارەکانی ترو پەیوەندی گرنگ لەگەڵ کەسانی تر وەک (کێشە لەگەڵ خزمەکانت یان ماڵەوەت یان هاوسەرەکەت یان کاری رۆژانەت یان خوێندنت) ؟؟

٧ – ئایا ئەم بەکار هێنانە وات لێدەکات هەست بە دورکەوتنەوە بکەیت لە گەڵ ئەو کەسانەی دەورو بەرت ؟؟

٨ – ئایا هەست بە دڵتەنگی و دودڵی دەکەیت لەکاتی دورکەوتنەوەت لە ئەنتەرنێت بەهۆی گەشتێک یان کارێکی کتوپڕ یان بەهۆی خوێندنەوە؟؟

٩ – ئایا هەست بە ژیانێکی خەیاڵی و نا واقیعی دەکەیت لە کاتی بیرکردنەوەدا؟؟

١٠ – ئایا خواردن و خواردنەوەت لە شێوە ئاسایی یەکەی خۆی لایداوە یان زۆرترین جار بەدەم بەکارهێنانی ئەنتەرنێت نانیش دەخۆیت ؟؟

لە کۆتایدا وەڵامەکانی بەڵێ بژمێرە ئەگەر لە هەشت وەڵام زیاتر بوو ئەوا مەترسی زۆرە ئەگەرنا بەگوێرەی وەڵامەکانی بەڵێ دەست نیشانی مەودای ئیدمان و وابەستەی خۆت دیار بکە بۆ نمونە ئەگەر پێنج بەڵێ بوو ئەوا وابەستەکەت نیوە بەنیوەیە ....

# چی دەربارەی خزمەتگوزاریەکانی کۆمپانیای گۆگڵ دەزانیت؟

Google™

## خزمەتیکی بەردەوام

**ئامادەکردنی: کاروان سەعید**

لەو کاتەیەوە کە گۆگڵ بۆتە هەڵسورێنەرو دابینکەری پلە یەکی کارو پێویستیەکانی زۆربەی بەکارهێنەرانی تۆڕی ئەنتەرنیت، وە یەکێکە لە گرنگترین ئەو کۆمپانیا بەناوبانگانەی کە خزمەت بە بواری تەکنەلۆژیای زانیاری دەکات، ئەرکی سەرشانی خۆی کە بەدەستخستنی زانیاریە لە ماوەیەکی کەمدا بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە جێبەجێ کردووە.

هەر کاتێک پێویستمان بەهەر زانیاریەک دەبێت جا سەر بە هەر بوارێکی ژیان بێت، ئەوا تاکە سەرچاوەی ئەمڕۆمان کە بیری لێ دەکەینەوە سایتی گۆگڵە کە لە ماوەیەکی کەمدا ئەو زانیاریانەمان بە دەست بدات، جا بۆیە پێویستە شارەزای خزمەتگوزاریەکانی سایتی دەوڵەمەند بە زانیاریەکان، سایتی گۆگڵ ببین.




### گۆگڵی زانستی (Scholar)

ئەو خزمەتگوزاریە کە لە ساڵی پارەوە بایەخی پێ دراوە، بۆ ئەوەی ببێتە وێستگەی یەکەمی گەڕان بۆ قوتابیانی خوێندنی باڵا بۆ ئەوەی بە دوای ئەو بابەتە زانستیانە دا بگەرین کە پیویستیان پێ هەیە، ئەم خزمەتگوزاریەش دوو جۆرە یەکەمیان گەڕانە بە دوای بابەتە تایبەتیەکانە SPECIAL SEARCHES، ئەوەی دووەمیشیان گەڕانە بە دوای زانکۆ و کۆلیژەکانە UNIVERSITY SEARCH .

### گۆگڵ بۆ ڤیدیۆ و دەنگ (sound & Video)

ئەم خزمەتگوزاریەش بەهەمان شێوەی گۆگڵی زانستی لە ساڵی رابردوو بایەخێکی زۆری پێ دراوە، ئەمەش زۆربەی ئەو کلیپە ڤیدیۆیانە و ئەو وانە دەنگیانە لە خۆ دەگرێت کە لەلایەن خەڵکانێک کۆکراونەتەوە کە باگکراوەندێکی زانستیان هەیە کە




بریتین لەو وانانەی کە لە زانکۆکانەوە دەوترێنەوە، یان کلیپە ڤیدیۆیی و دەنگیانەی ئەو کۆنفرانس و کۆنگرانەی کە لە سەرانسەری جیهان دەبەسترێن، بە چونە نێو ئەو خزمەتگوزاریە سودێکی زۆر بە داواکارەکەی دەگەیەنێت.

## نەخشەکانی گۆگڵ و گۆگڵی زەوی (Maps و Earth)

ئەو خزمەتگوزاریە بایەخێکی زۆر دەگەیەنێت بە بوارەکانی مێژوو و جوگرافیا و جیولۆجی، ئەمەش لە رێگەی بەکارهێنانی ئەو نەخشانەی کە بەکار دێت بۆ دەست نیشان کردنی شوێنە جوگرافی و مێژوویەکانی جیهان لە سەر رووی زەوی، بەلام ئەوەی تایبەتە بە گۆگڵی زەوی () ئەم بەرنامەیە لەلایەن مامۆستایەکی جیۆلۆجی بەکاردێت لە ئەمەریکا بۆ ئاشناکردنی قوتابیەکانی بەو شوێنانەی کە بەردی ئاگرینی تیادا کۆبۆتەوە لە ئەمەریکا، ئەمەش یەکێکە لەو نمونانە کە لەوانەیە چەندان نمونەی تریشی هەبێت.

## گەڕان بە دوای کتێب (Book Search)

بەکارهێنەرانی سایتی گوگڵ ئەم خزمەتگوزاریە بە گرنگترین دەزانن لە لیستی خزمەتگوزاریەکانی گۆگڵ لە بواری فێرکردن، کێ هەبوو رۆژێک بیر لەوە بکاتەوە کە بتوانێت سەدان کتێب لە بەر دەستیدا کۆبکاتەوە بەبێ ئەوەی سەردانی کتێبخانەیەکیش بکات، ئەمەش تەنها لە رێگەی گۆگڵەوە دەبێت.

## وەڵامەکانی گۆگڵ (Answers)

ئەگەر چی ئەم خزمەتگوزاریە بە خۆڕایی نیە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بایەخێکی زۆری هەیە بۆ ئەوانەی بەدوای هەندێک زانیاریدا دەگەڕێن بەلام سەرچاوەی زانیاریەکانیان لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت نادۆزنەوە، ئەوا لەرێگەی ئەم خزمەتگوزاریەوە کە زیاتر لە ٥٠٠ کارمەند تیایدا کاردەکات، زانیاریەکەت بەدەست دەکەویت لە کەمترین کاتدا بۆ هەر پرسیاریکیش ٢ دۆلار دەدەیت .

## پۆستی ئەلیکترۆنی (Gmail)

خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیکترۆنی خزمەتگوزاریەکی بەناوبانگی گۆگڵە، بەلام ئەوەی ئەم خزمەتگوزاریەی گۆگڵی پر بایەختر کرد، بەستنەوەی بەرنامەی گفتوگۆ کردنی گۆگڵ بوو لەگەڵ رووبەری پۆستی ئەلیکترۆنی، کە لەلایەک خزمەتێکی گەورەی بە مەیدانی گفتوگۆ کردن بەخشی لەلایەکی ترەوە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ بواری فێربوونی خێرا بە هۆی ئەنتەرنێتەوە کە لە زۆر زانکۆی جیهان بەکاردێت.

## گرووپی کۆکراوەی گۆگڵ (google group)

گرووپی کۆکراوەی گۆگڵ بریتیە لەو کۆمەڵە خزمەتگوزاریەی گۆگڵ کە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەریدەکات، وەکو گەڕان بە دوای وێنە و سەیڤ کردنی لاپەڕەکانی وێب و خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵە خزمەتگوزاریەش بە خۆڕاییە.

سەرچاوە: البوابة العربية للمعلومات التقنية.








# پەیوەندی بکە بەبێ ئەوەی ژمارەی مۆبایلەکەت دەرکەوێت

شادی جلال

بـۆ ئەو کەسـانەی کە مۆبایلـی نۆکیا هەڵدەگرن دەتوانن لەگەڵ من بن بۆ ئەوەی لێرە بـەدواوە هەرکاتێک تەلەفۆن بکەیت بە هەر شێوەیەک ژمارەی تەلەفۆنەکەت دەرنەکەوێـت، بەچـوار هەنـگاوو بەس تەنها لە مۆبایلی نۆکیا ئەم تایبەت مەندیە هەیـە، بەبـێ ئـەوەی ژمـارەی تایبەتی خـۆت دەرکەوێـت دەتوانیـت پەیوەندی بکەیـت بڕوانە هەنگاوی یەکـەم مەرجە که نابێت مۆبایلەکەت و سـیم کارتەکەت هیچ ژمارەیەکی تەلەفۆنـی تێدابێت واتە دەبێـت بەتاڵ بێت، ئینجـا دوایی دەچینە سـەر هەنگاوی دووەم بریتیە لە پەیڕەو کردنـی ئـەم هەنگاوانـەی خـوارەوە لەسەرەتادا دەچینە سەر (الضبط) دوایی (ضبط الهاتف) پاشان بۆ (تأكيد تطبيقات خدمـات البطاقة) لـە کۆتایـی هەنگاویی دووەم (إيقاف العـرض) هەڵدەبژێرن، لە هەنـگاوی سـێیەمدا بە هەمان شـێوە تا هەڵبژاردنی(ضبط هاتف)وەک خۆی دوایی دەچینە سـەر (ضبـط الحماية) دواتریش بۆ (مجموعة مسـتعملين محددة) پاشـان (تعمـل) هەڵدەبژێرین پاشـان مۆبایلەکە دەکوژێنینەوەو دایدەگیرسێنینەوە پاشان دەچینە هەنگاوی چوارەم راسـتەوخۆ لە (ضبط هاتف) دەچینە سەر (اللغة) پاشان هەبژاردنـی (DEUTSCH) . دوا هەنـگاو بریتیە لە کوژاندنـەوەی مۆبایلەکەتەوەو دەرهێنانـی سـیمکارتەکەت و دوایـی دانانـەوەی و کارکردن بـە مۆبایلەکەت بەمـەش هـەر پەیوەندیـەک بکەیـت ژمارەکەت دەرناکەوێت .

# بچوکترین فلاش میمۆری




ئەمام عمر

مەسەلەی بچوکی و گەورەیی فلاش میمۆری ئەوەندەی لە قەبارەی داتاکان بوو ئەوەندەش لە قەبارەی و شێوەکەی بوو پێش دروست کردنی فلاش میمۆری هەموومان گیرمان خواردبوو بە دەست فلۆپی دیسک ئێستاش بێزارین لەم فلاشانە لەبەر گەورەیی و گرانی هەڵگرتنیان بەڵام بەم دوایانە بچوکترین فلاشی دنیا کەوتە بازاراوە.

ئەم فلاش میمۆریەوە زۆر بچوکەو دەتوانرێت لەناو جانتای بچوکی گیرفان هەڵگیرێت و هەروەها شوێنی حەلقەو میدالیای هەیە کە دەتوانرێت بە شێوازی تر هەڵیان بگریت، تایبەتمەندیەکانی ئەم فلاشە بریتەی لە:

- بچوکترین فلاش میمۆری لە جیهاندا
- بەئاسانی دەتوانرێت هەڵبگیرێت و بپارێزرێت.
- دەتوانێت هەموو فایلێک بە هەر پاشبەندێک بێت بپارێزێت.
- لە هەموو پۆرتەکانی (USB) کاردەکات.
- هەرسێ قەبارەی 128، 256، 512 MB هەیە.





# هاکەرەکان گەشتنە مۆبایلەکانیش

**بێستون عمر**

زۆرمان بیست دەربارەی سیخوڕی و هاکەرو دزین لە ئەنتەرنێت و ئەمجارەشیان هەمان شت و هەواڵێکی مەترسیدارە، ئەمجارەشیان مۆبایلەکان دەکەونە بە رەحمەتی هاکەرەکان بەڵام تەنها ئەو مۆبایلانە دەگرێتەوە کە بلوتوسیان هەیە، کۆمەڵێک هاکەرز کەناویان لە خۆناوە فلیکسیلیس FLEXILIS هەلساون بە دروستکردنی دەمانچەیەک بۆ برینی دیوارەکانی مۆبایلەکان و چونە ناوئەو مۆبایلانەی کە بلوتوسیان هەیە ئەم چەکەیان ناو ناوە بلو سنایبر BLUESNIPER ، ئەم بەرنامەیە دەتوانێت هەر مۆبایلێک بگاتە ئامانج کە بلوتوسیان هەیە لە مەسافەی زیاتر لە میلێک وە دزینی هەموو بەیانات و هەموو مەلەفاتە تایبەتیەکان تا دەگاتە دفتەری تەلەفۆناتیش وە هەموو کورتە نامەکان وە دەتوانن نامە بەجێبێڵن و دابینین لەناو مۆبایلەکان ئەوەی زۆر مەترسیدارە ئەم هاکەرانە دەتوانن تەلەفۆنی کەسەکە بەکاربهێنن بۆ پەیوەندی کردن بەبێ ئەوەی خاوەنەکە هەست بکات . بۆ نمونە وا تەصەور بکە کە لەگەڵ هاوڕێکەت دانیشتویت وە مۆبایلەکەت لەناو گیرفانتە وە لەم کاتەدا بە بێ ئاگای تۆ هاکەرەکە دەست بەسەر مۆبایلەکەت دادەگرێت و بە ئارەزوی خۆی تەلەفۆنی پێدەکات و لەهەمان کاتدا دەتوانێت وەک ئامێرێکی سیخوڕی بەکاری بهێنێت بۆ گوێگرتن لە قسەی تۆو هاوڕێکەت وە هەرجارێک دێتە ناو مۆبایلتەوەو دێتە دەرێ بەبێ ئەوەی هیچ شوێنەواری دیاربێت .پێش ئەمانەش زانایەکی ئەڵمانی هەستا بە پەرەپێدانی بەرنامەیەک بەناوی BLUEBUG کە دەتوانێت دەست بەسەر ئەو مۆبایلانەدا بگرێت کەوا بلوتوسیان





هەیە وە گۆڕینی بۆ ئامێرێکی سیخوڕی بۆ گوێگرتن لەو قسانەی کە خاوەن مۆبایلەکە لەگەڵ هەرکەسێک دەیکات بۆ نمونە لەڕێگای کۆمپیوتەر دەتوانرێت ئەم بەرنامەیە کاری پێبکرێت و دەتوانرێت تەحەکم بەسەر مۆبایلەکانەوە بکات، زۆربەی ئەو مۆبایلانەی کەوا توشی ئەم هاک دەبنەوە بلوتوسەکانیان لەسەر DISCOVERABLE یان VISIBLE لەم دوحاڵەتەیەو مەترسیدارترینیانن کەوا هاکەرەکان بتوانن مۆبایلەکان هاک بکەن بۆیە وا باشترە تەنها لەکاتی پێویست نەبێ ئەگەرنا بەردەوام با لەحاڵەتی OFF دابێت باشترە بەڵام لە هەندێ لە نۆکیاکان بە کوژاوەیەیش هەر دەتوانرێ هاک بکرێت هەموو ئەم کردارەش پشت دەبەستێت بەزانینی جۆری بلوتوسەکە کە ئەمەش لەرێگای چەند بەرنامەیەک دەبێت کە لە ئەنتەرنێت دەست دەکەون، تائێستا لەکوردستان نین بەڵام پێویستە بەردەووام لەم جەردەو دزانە ئاگاداربین.

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

* هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .
* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.
* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەرێتەوە.
* هەر کەسێک بابەت ئەنێرێ بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.




وێنەی (١)

# چۆنیەتی گۆڕینی کاسێت بۆ CD

نووسینی // کامەران خۆشناو
kameran7605@yahoo.com

بەکارهێنانی شریتی کاسێت وە هەرزانیەکەی بۆتە ئەوەی کە لە هەموو شوێنێک هەبێت، لەماڵەوە ولەناو سەیارەو شوێنی تر، وە لەوانەیە ئەم کاسێتە زۆر بەنرخ بێت یاخود بیرەوەرییەکی خۆش بێت، یان نوسخەی گورانیەک بێت .

وە ئێستا ئێمە لەناو سەدەی دیجیتاڵ داین، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئێمە واز لە لە بیرەوەرییەکانی خۆمان بهێنین، بەڵکو ئەتوانین ئەم کاسێتانە بگۆڕین بۆ سیستەمی ژمارەیی (MP3)، بۆ ئەوەی بتوانین بەکاری بهێنین لەسەر کۆمپیوتەر و لەناو سەیارەو وە هەروەها ناردنی بەشێوەی ئیمەیل بۆ برادەرەکەت لە هەر شوێنێک بێت .

ئامادەکردنی ئامێرو کەل و پەلەکان:

هەڵدەستین بە ئامادەکردنی کۆمپیوتەر لەڕووی ئامێرو بەرنامە بۆ بەکارهێنانی لەم کارەدا، پێویستە کۆمپیوتەرێکی تا ڕادەیەک نوێت هەبێت، وە بەستراوبێ بە کارتی دەنگ، وە بۆ ئەوەی دەست بەکارەکە بکەین هەڵدەستین بە بەستنی ئامێری کاسێت بە کارتی دەنگ لە کۆمپیوتەر، سەرێکیان دەبەسترێت لە شوێنی دەرچووتی دەنگ -LINE OUT لە ئامێری کاسێت وە سەری تریان ئەبەستریَ لە شوێنی چوونە ژوورەوەی دەنگ LINE-IN لە کارتی دەنگی کۆمپیوتەر، وە باشترین بەرنامە کە بەکار دەهێنریَ وە ئاسانترین بەرنامە بریتییە لە ( MUSIC MATCH JUKEBOX ) ئەتوانی بچیتە سایتی

HTTP:// WWW.MUSICMATCH.COM

بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە بۆ سەر کۆمپیوتەر کە قەبارەکەی نزیکەی (٩) میگا بایتە .

دەست کردن بە کار :--

پاش ئەوەی بەرنامەکەت دابەزاند بۆ سەر کۆمپیوتەر، وە هەڵسای بە بەستنی کێبڵی دەنگ لە کۆمپیوتەر بۆ ئامێری لیدانی کاسێت وە دەست بکە بەکردنەوەی بەرنامەکە .

لە لیستی سەرەوە بڕۆ بۆ OPTION دوایی RECORDER دوایی SOURCE دوایی LINE – IN، ئێستا دەبینین پەنجەرەیەکی نوێ دەکرێتەوە لە خوارووی بەرنامەکە ( وێنەی ژمارە ١)، ئەگەر بەدیار نەکەوت دوگمەی REC دابگرە .

دوگمەی REC دادەگرین لەم پەنجەرەیە، وە دەست دەکەین بە لێدانی کاسێتەکە، کاتێک تەواو دەبێت دەست بە دوگمەی (STOP) وەستان دەکەین، پێویستە تۆماری دەنگەکەی کردبێت وە دیاربێت لەناو بەرنامەکە .

دەتوانین ئەمە دووبارە بکەینەوە بۆ

تۆمارکردنی هەر دەنگێکی تر، وە ئەم دەنگانە تۆمار دەکرێن بە خێرایی ١٢٨ KBPS کەئەمە ئاستێکی بەرزە .
پلەکانی دەنگ : ---
گواستنەوەی دەنگ لە ئامێری ستریۆ بۆ کۆمپیوتەر بە بەکارهێنانی بەرنامەی ویندۆز خۆی .
لەسەر شریتی (TASK BAR) نیشانەی بڵندگۆ دەبینین (بەرزی و نزمی دەنگ)، وە دەبێ کلیکێکی لەسەر بکە بە بەکارهێنانی PLAY CONTROL یان VOLUME CONTROL، دەست دەکەین بە هەڵبژاردنی OPTIONدوایی PROPERTIES پاشان RECORDING دوایی OK (وێنەی ژمارە ٢)،دەبینین پەنجەرەی RECORD CONTROL بەدیار دەکەوێت، وە دەست دەکەین بە هەڵبژاردنی پلەکانی بەرزو نزمی دەنگ کە پێویستمانە .
ئاگاداربە دوگمەی MUTE BUTTON بەکارنەهێنی ئەگینا لەکۆتاییدا هیچ شتێک بەدەست ناهێنی .
دەتوانین لەم بەرنامەیەدا چەند کردارێکی جوانی تر بەکاربهێنین بۆ تۆمار کردن لە بۆ وە دەست هێنانی



وێنەی (٢)

دەنگێکی جوان، بۆ هەڵسان بەم کارە برۆ بۆ OPTION دوایی SETTING دوایی RECORDER دواییCD QUALITY (وێنەی ژمارە ٣)، وە لەم سندوقە هەڵسە بە هەڵبژاردنی تەئسیراتی دەنگ ئەوەی ئەمانەوێ وەکو نزم بوونەوە بە پلە FADES وەهی تر، بۆ تۆمارکردنی MP3 وەکو تۆمارکردنە پێشکەوتووەکان
پاش ئەوەی هەڵساین بە تۆمارکردنی چەندین گۆرانی و مۆسیقا بۆ سەر کۆمپیوتەر کە کۆی کاتەکانی گەیشتە ٨٠ خولەک، دەست دەکەین بە کۆپی کردن بۆ سەر CD وە دەتوانین کەم و زیادی بکەین وە چەندین کرداری تری بۆ ئەنجام بدەین وە لە کۆتاییدا دەست بە دوگمەی CD CREATE دەنێین بۆ تۆمارکردن بۆ سەر (CD) .



وێنەی (٣)

# کۆمپانیای (Sony Ericsson) مۆبایلی تازە دەکاتە بازاڕەوە

ئا: دەوەن مسعود ساڵەیی
WWW.DAWWAN.COM




میمۆریـە کـەی (4GB) چوار گیگا بایتە بەمەش تا ئێستا تا کـە مۆبایلە بەوقەبارەیە.!!! هەندێ لـە نهێنیەکانی مۆبایلی (SAMSONG):

١- (*#9998*228#) بـۆ زانینی پلـەی گەرما ویەکەی پاتری، وەشتی تریش.

٢- (*#9998*289#) بۆ تاقی کردنەوەی (SPEAKER).

٣- (*#9998*523#) بۆ کاڵ و تۆخ کردنی ڕەنگی شاشە.

٤- (*#9998*842#) بۆ تاقی کردنەوەی لەرزۆک.

٥- (*2767*2878#) بۆ فۆرمات کردنی مۆبایلەکە.

٦- (*#06#) بۆ زانینی (SERIAL NUMBER)

سەیرو سەمەرەترین مۆبایل لە جیهاندا(NOKIA 888).!!!

لـە خاسـیەتیەکانی ئەم ئامێـرە ئەوەیە کە توانـای گۆرینی شـێوەکەی بۆ بازنە ولولپێچ و ڕاسـتە و وەشتی تریش وەکو ئاوێنە و کاتژمێری دەست بە کاردێ.

هەندێ لە نهێنیەکانی مۆبایلی (NOKIA):

١- (*21*444#)بـە کاردێ بۆ گرتنـی نووکە جەڕەس وە بۆ (تحویل مکالمات).

٢- (#21#) بۆ لابردنی ئەم کارەی سەرەوە.

٣- (*#0000#) بۆ زانینی بەرواری دەرچوونی مۆبایلەکە.

٤- (*#7370#) بۆ فۆرمات کردن.

٥- (*#3370) بۆ (RESTART) کردنی مۆبایلەکە.

٦- (*#92702689#) بۆ زانینی زانیاری گشتی ئامێرە کە.

وە بـۆ هەڵکردنـی (ڕادار): پێویسـتە ئـەم خاڵانـەی لای خوارەوە ئەجام بدەین .

١- بچۆ سەر ( القائمة).

٢- بچۆ سەر( الضبط).

٣- بچۆ سەر(ضبط الحمایه).

٤- بچۆ سەر(المجموعة المحددة).

٥- بچۆ سەر(تعمل).

٦- دوای ئـەم کردارنە داوای ژمارەی نهێنیت لێ دەکات کە چوار سفرە(٠٠٠٠)

٧- بچۆ سەر (موافق)

تێبینی ئەم کردارانە بۆ هەموو مۆبایلێک نابێت.




# نوێترین دەزگا بۆکاری دەنگی بەکاردێت

**ئا: کاردۆ**

ئەو کەسانەی کەئارەزووی کاری دەنگی دەکەن وەیان پسپۆڕن و لە بواری دەنگی کاردەکەن کۆمپانیای CRAETVE هەڵساوە بەدروستکردنی دەزگایەکی نوێ بۆکاری دەنگی، خۆشەویستان ئەم دەزگایە دەتوانیت لەکاڵەوە بەکاری بهێنی لەگەڵ کومپیتەرەکەدا بەبێ ئەوەی ستودیۆی دەنگی بەکاربهێنیت، کەدەتوانین بەهۆی ئەم دەزگایەوە هەموو کارێکی هونەری دەنگی بکەیت .

ئێمە لێرەدا باسی کارەکانی ئەم دەزگایە دەکەین.

١-لەگەڵ کامێری کۆمپیتەر دەبەسترێت بەهۆی USBیەوە.

٢- دەتوانیت دوو مایکروفونی لەگەڵ ببەسترێت و بەهۆی ڤۆلیۆمی ئامێرەکە کونترۆڵی مایکرۆفۆنەکە بکەیت.

٣- سیستەمی لێزەری دیجتاڵی دەنگی IN و OUT بەجۆری 48KBT وەردەگرێت

٤- پۆرتی MIDI IN OUT هەیە کەدەتوانرێت ئامێری مۆسیقا (ئۆرگ) لەگەڵیدا ببەسترێت.

٥- بەستنی ئامێری فیدیۆ AV IN کەدەتوانرێت وێنە بگوازێتەوە بۆناو کۆمپیتەرەکە.




# دروستکردنی پرۆسێسەری نوێ بەناوی (Intl D)

**ئا: هاوکار ڕەحمان**

کۆمپانیای INTL لەبواری دروستکردنی پرۆسێسەر چەندین جۆر پرۆسێسەری دروست کردووە لەوانە پرۆسێسەر پینتیوم یەک و دوو و سێ چواریش، بۆیە ئێستاکە هەڵساوە بەدروست کردنی پرۆسێسەرێکی تازە بەئەندازەیەکی بەهێزکاردەکات وەچەندین جیاوازی هەیە (وێنەی ٢).

لەم وێنەیەدا دەبینین کە جۆری سێیەمیان زۆر بەهێزە کە پرۆسێسەری D یە کەڕووی زاکیرە دووئەوەندی پێشووە وە لەڕووی بەصەکانیەوە هەندوونیوی پێشووە بۆیە والی دەکات کەبەشێوەیەکی خێرا کاربکات ئەوەی شایەنی باسە ئەم پرۆسێسەرە زۆر درەنگ گەرم دەبێت وە زۆر دوورە لەوەستان و جام کردنی بەرنامەکان وەک لەم وێنەدا دەبینین (وێنەی ٣).

هەربۆیە کۆمپانیاکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەدوای شتی تازەوەن.

# بەرنامەی Game Gain-Make Game Run Faster




## ئا: تەڵعەت

بێگومـان زۆربەمـان حـەز بـە گێمی سـەر کۆمپیوتەر دەکەین بـەلام هەندێ جـار لەبەر زۆری هێـزی گێمەکە دەبێتە هـۆی گـران کردنـی کۆمپیوتەرەکانمان لەوکاتەشـدا ناتوانیـن یاریـەکان تەواو بکەیـن چونکـە کۆمپیوتەرەکانمان زۆر قورس دەبـن و هەندێ جاریـش دەبێتە هـۆی جـام کردنـی کۆمپیوتەرەکانمان بـەلام ئـەو بەرنامەیە ئەو کێشـەیەمان بـۆ چارەسـەر دەکات سـەرەتا پـاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەسـەرەوەی بەرنامەکە ناوی ویندۆزەکەمانی نووسیوە لەژێر ئەویشدا ناوی پرۆسێسەرەکەمانی نوسیوە هەروەها لەژێر ئەمانەش گێچێک هەیە کەسـەرەتاکەی FAST نوسـراوە و کۆتایشـی FASTER نووسراوە واتا خێرا و خێراتـر ئەگەر ئەو گێچە ببەین بۆ لای کۆتاییەکـە واتـا FASTER ئـەوا یاریەکە خێراتر دەبێت.